٢٠٠٠ت

# سُبْحَانَكَ اللّٰهُمَّ

## پەروەردگارا بێگەردی و پاکی بۆ تۆیە

نزا و دوعاکان

یادو زیکرەکان

ویردەکانی ئێواران و بەیانیان (المأثورات)

چل دوعا لەقورئانی پیرۆزەوە

سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

ناوە پیرۆزو جوانەکانی پەروردگار (أسماء الله الحسنی)

ئامادەکردنی:

**جەمیل ئیبراهیم**

وەرگێڕانی:

**رزگار کەریم**

حبیب، جمیل ابراهیم، ۱۹۴۴ - م.
سبحانك اللهم پەروەردگارا بیگەردی و پاکی بو تویه... / ئامادە کردنی جەمیل ئیبراهیم؛ وەرگیرانی رزگار کەریم. -- تهران: احسان، ۱۳۸۳.
۲۷۹ ص.
ISBN: 964-356-340-5
کردی.
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
۱. دعا. ۲. دعا -- احادیث. الف. کریم، رزگار، ۱۹۷۱ - م.، مترجم.
ب. عنوان.
۲س۲ح/BP۲۶۶/۸ ۲۹۷/۷۷
کتابخانه ملی ایران م۸۳-۴۶۴۴

● ناوی کتێب: سبحانك اللّهم
● نووسینی: جەمیل ئیبراهیم
● وەرگێڕ: رزگار کەریم
● بڵاوکار: نەشری ئحسان
● تیراژ: ۵۰۰۰ دانە
● سالی چاپ: چاپی یەکەم-۲۰۰٤
● شابک: ISBN: 964-356-340-5 / ۹۶۴-۳۵۶-۳۴۰-۵
● ژمارەی سپاردنی: (        ) وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# نزاو دوعا

پەروەردگارا؛ ببورە لە تاوانو هەڵەو نەزانینو زیادەڕەوی لەڕەفتاروکردارەکانمو ئەوەشی تۆ شارەزاو زانای پێم..

پەروەردگارا؛ ببورە لەڕاستو گاڵتەو هەڵەو دەستەنقەستو هەمووی هەر لەخۆمەوەیە..

پەروەردگارا؛ ببوورە لەرەفتارو کردارەکانی پاشو پێشو دیارو پەنهانو ئەوەی تۆ شارەزاو زانای لێمو هەر تۆ پاشو پێشخەری کردارەکانیو زاڵو دەستەڵاتداری بەسەرجەم ویستەکاندا ..

# پێشەكی وەرگێڕ

## بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری بالآدەست و سلآو و دروودیش برژێت بەسەر گیانی پاكی پێغەمبەری پێشەواو یارویاوەران و شوێنكەوتووانی هەتا رۆژی قیامەت..

یەكێك لەو كتێبە مەزن و ناوازانەی كەلەبواری دوعاو سوننەتەكانی پێغەمبەرو ویردو زیكرەكاندا نووسراوە كتێبی (سبحانك اللهم)یەو بەدرێژایی سالآنێكی دوورودرێژ خزمەتێكی گەورەی بەتاكی موسولّمان كردووە..

ئەم كتێبەش چەند تایبەتمەندییەكی لەخۆگرتووە كەوا كتێبەكانی دیكەی هەمان بوار تیایاندا نی‌یە یان بەكالّی و كزی بەدی دەكرێت تیایاندا.. لەو تایبەتمەندیانەش:

**یەكەم/** ئەم كتێبە سەرجەم بوارەكانی نزاو دوعاو زیكری لەخۆگرتووەو وێڕای بەدەرخستنی ئەجرو پاداشتی دوعاونزاگۆو سەرجەم بەندایەتیەكانی دیكە.

**دووەم/** بەچەشنێكی جوان و دانسقە رێكخراوەو هەربەشەی لەشوێن و جێ ی خۆیدا تۆماركراوەو بەهێزترین نزاو دوعا و سوننەتی تێدا هێنراوە.

**سێیەم/** فەرموودەو نزاكانی ئامازەی بەسەرچاوەكانی تێدایە ؛ مەگەر لەهەندێك شوێن و جێگەدا نەبێت و ئەویش زۆربەكەمی بەدی دەكرێت

چوارەم/ هیچ زیکرو دوعاو یادی بۆنەیەك لەبۆنەکان نیە مەگەر تۆمارکراوەو دەکرێت موسوڵمان بیکات بەکتێبی ژیانی رۆژانەی خۆی‌و دەست بەرداری نەبێت

سەرەڕای ئەم تایبەتمەندییانەش چەندین تایبەتمەندی دیکەی تێدایە ، بۆیە ئێمەش بەباشمانزانی وەری بگێڕین بۆ زمانی شیرینی کوردی هەتا جێگەی سوودو خێرانداری بێت‌و تاکی کوردیش هەریەك لەزیکرو دوعاو سوننەت‌و ناوە پیرۆزو جوانەکانی لەکتێبێکدا بەدەستەجەمی بەردەست بکەوێت.

هیواداریـن خـوای گـەورە لێمـان وەربگرێـت‌و لەکـەم‌و کورتیەکانیشمان ببورێت‌و چاوپۆشیمان لێ بکات

ئامین

رزگار کەریم

وەرگێڕ

# پێشەكی نووسەر

## بسم الله الرحمن الرحيم

بێگومان نازانین ساوایەكی شیرەخۆر چۆن دوور لەباوك و دایكی دەژی و ئەندێشەی سەبارەت بەژین و خۆشەویستی و ڕق و قین بەباردێت و ڕەنگ دەداتەوە لەسەر ڕەوش و هەڵس وكەوتی، بێگومان ئەوساوایە كوێرانە هەنگاوەكانی لەكاروانی بەرفراوانی ژیاندا هەڵدەگرێت چونكە پێشەنگێكی زیندووی لەدەستداوەو نموونەیەكی بەرجەستەی زیندوو نی یە لەبەردیدو چاویی دا.

بەهەمان چەشن پەڕاگەندەیەكی ئاوارەش كاتێ بەدووردەكەوێتەوە لەئامێزی خاوخێزان و خۆشەویستانی دەكەوێتە هەمان قەیران و ئەزموونەوە.

مرۆڤیش لەگەشتی ژیانی دونیایدا گەر بەدووربێت لەپەروەردگارەكەی كەبەدیهێناوەو بەجوانترین شێوە ڕێكسازی تێدا ئەنجامداوەو پەروەردەو ڕێنومایی كردووە ؛ ئەوا بێگومان ژیانێك بەسەردەبات مەرگ باڵادەست دەبێت بەسەریاو بەكوێرانەو بەدبەختی دوایی پێدێت..

هەروەك چۆن ساوای شیرەخۆر لەئامێزی دایك و باوكیدا هەست بەسۆزو میهرو جمووجوڵ و بزاوت دەكات هاوكات لەگەڵ جووڵەی زاری پیرۆزی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەیادی پەروەردگارە خۆشەویستەكەی نموونەیەكە بۆ ئەو ئەوینە

بەرفراوانە ، بۆیە مرۆڤیش ژینێكی پڕ لەشادیی و خۆشی و ڕەزامەندی بەسەردەبات كاتێ هەست بەنزیكی لەپەروەردگار دەكات ، ئەمەش بەهۆی نزاو دوعاوە بەدی دێت و هۆیەكیشە بۆ داباریني سۆزو میهری پەروەردگار بەسەر بەندەكەیدا ، نزاو دوعاش گیرایە لای پەروەردگار گەر مەرج و ڕێوڕەسمەكانی تێدا بەرجەستە ببێت، مرۆڤیش دەتوانێت بەهەر زمان و شێوەیەك دوعا بكات لەقاپی پەروەردگارەكەی بەڵام باشترین نزاو دوعایەك ئەو نزایانەی قورئانی پیرۆزە كەوا لەسەر زاری پێغەمبەرانی تۆماركراوەو هاوكات لەگەڵ نزاودوعاكانی پێغەمبەری خواو بەدەستهێنانی سەرجەم دەروازەكانی خێریش لەدووپاتكردنەوەی نزا تۆماركراوەكاندایە هەتا نزای نوێ و بەدیهێنراو، چونكە ئەو نزایانە گشت داواكانی لەخۆگرتووەو دڵ و دەروونیش هەست بەهێمنی و ڕازی بوون دەكات كاتێ هەمان نزای پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست دووپات دەكاتەوە..

بەڕادەیەكی كەم لەبیركردنەوەو ڕامانیش هەست دەكەیت ئەم نزاو دوعایانە دەلاقەیەكی پڕ لەئاسوودەیت لەسەر والأدەكەن و پێشتر هەستت بەوخۆشی و شادییە نەكردووە، لەنزاكانی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ژیان و بزاوتێكی تێدایە كەلەنەبوونەوە ڕایەڵەی بەستووە بەرەو جیهانی بوون و هەتاهەتایی ؛ نەوەك بەوچەشنەی هەندێك لەنەزان و بێئاگایان نزاو دوعا بەچەشنێ لەدیمەنەكانی مەرگ و گۆڕو قیامەت پێش چاو دێت.

مەرگیش دوایین گەشتی مرۆڤ نی‌یە لەم بوونەدا بەڵکو یەکێکە لەقۆناغەکانی سەرە ڕێی ژیانی مرۆڤ و دەروازەیەکە بۆ پێ هاویشتنە بوونێکی هەتا هەتایی‌یەوە ، ئەوەتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەنزاو دوعاکانیدا دەفەرموێت: ((پەروەردگارا؛ لەدنیاو قیامەتدا چاکەو خێراندارمان بکەو لەسزای ئاگری دۆزەخیش بەدوورمان بگرە)) هەروەها لەنزاو دوعایەکی دیکەدا دەفەرموێت: ((پەروەردگارا؛ خوازیاری لێخۆشبوون و لەش ساغیم لەدنیاو قیامەتدا )) بۆیە دنیاو قیامەت ، ژین و مردن هاوتای یەکن و لێك نابڕێن ؛ بەڵکو ژیانی مرۆڤ لەڕۆژی لەدایك بوونیەوە درێژدەبێتەوە هەتا هەتایەو ئێدی ئاوا نابێت.

پێغەمبەری ئازیزیش دەیەوێت ئەم ژینە بەخۆشی و شادی بەڕێ بکرێت و لەدوایی و قیامەتیشدا باش و چاك بێت.

هەروەها لەم بوارەشدا کتێب و نووسینی جەم و زۆر هەیەو نووسەرانیان نزاو دوعاکانی پێغەمبەریان کۆکردوەتەوە لەبەهێزو لاوازو هەڵبەستراو هەندێك لەنووسەرانی دیکەش چەند دەروازەیەکی کەم و کورتیان باسکردوە کەپێداویستیەکانی موسوڵمانی بەدی نەهێناوە.

بەهەر حاڵ پەروەردگار پاداشتی هەموویان بداتەوەو ڕەزامەند بێت لێیان، منیش بەش بەحاڵی خۆم لەهەریەك لەو بەرهەمانە گوڵچنێکم کردووەو بەچەشنی گونجاوو شیاوو پێویست بۆ تاکی موسوڵمانم ڕیزبەندکردووە.

لەكۆتایشـدا دەڵێـم ئـەم كتێبـەم بـەدووره لەفـەرموودەی لاوازو هەڵبەسـتراو گـەرچی زانایـان فـەرموودەیلاوازیان لاپەسـەندو گونجاوە بەمەجێك لـەبواری هـاندان و تۆقـاندن و نـزاو دوعـادابێت؛ وێـڕای ئـەوەش بانگەشـەی تـەواوو كـامڵبوونی ئـەم هەوڵـە ناكـەمو بـەڵكو بـەپێی توانـای خـۆم هەوڵمداوەو پاكانـەش ناكـەم بـۆ خـۆمو بەتـەنیا داواخـوازی سەركەوتن و پەسەند كردنی كارەكانم لەپەروەردگار..

جەمیل ئیبراهیم
ئامادەكار

# بەشی یەکەم

## پلەو پایەی یادکردن‌و یادەوەران

لەقورئانی پیرۆزدا
لەسوننەتی شیریندا
لەدیدی زانایاندا

# لەقورئانی پیرۆزدا

١ـ قال تعالى: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾[(فاطر:١٠)].

واتە: ((گوفتاری چاكو جوانو بەجێ بۆ لای ئەو زاتە بەرزدەبێتەوە))[1].

٢ ـ قال تعالى : ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلا تَكْفُرُونِ﴾ [(البقرة:١٥٢)].

واتە: ((ئەی ئیمانداران ئەگەر یادی من بكەن منیش یادی ئێوە دەكەمو سوپاسگوزاری من بنو سوپاس ناپەزێرو سپڵەیی بەرامبەرم مەكەن))[2].

٣ ـ قال تعالى: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْراً كَثِيراً﴾ [(الأحزاب:٤١)].

واتە: ((ئەی ئەو كەسانەی ئیمانو باوەڕتان هێناوە زۆر زۆر یادی خوا بكەن))[3].

٤ ـ ﴿وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ﴾[(العنكبوت:٤٥)].

---

[1] تەفسیری ئاسان: ٤٣٥.

[2] تەفسیری ئاسان: ٢٣.

[3] تەفسیری ئاسان: ٤٢٣.

واتـە: ((بێگومـان یـادی خـوا لەهــەموو شـت گـەورەترو بەنرخترە))[٤].

٥ ـ ﴿فَلَوْلا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ ، لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَـى يَـوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ [(الصافات:١٤٣ـ١٤٤)].

واتـە: ((خـۆ ئەگـەر لەوكەسـانە نەبوایـە كـە تەسـبیحاتو یادی خـوا دەكـەن ، ئەوە دەمایەوە لەسكی نەهەنگەكەدا تـا ڕۆژێ كەهەمووان زیندوو دەكرێنەوە))[٥].

٦ ـ ﴿إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيراً﴾[(الأنفال:٤٥)].

واتــە: (( كــاتێك دەگەنــە دەســتەیەكو ڕووبــەڕووتان دەبنەوە، ئەوە دەبێت خۆڕاگربنو سەنگەر چۆڵ نەكەنو زۆر یادی خوابكەنو لێی بپاڕێنەوە))[٦].

٧ ـ ﴿لا تُلْـهِكُمْ أَمْوَالُكُـمْ وَلا أَوْلادُكُـمْ عَـنْ ذِكْـرِ اللَّهِ﴾[(المنافقون: ٩)].

واتە: (( هەوڵبدەن نەماڵو سامانتان ، نەڕۆڵەكانتان نەبنە هۆی ئەوەی كەلەیادی خواو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو كەمتەرخەمیو بێئاگاتان بكەن))[٧].

---

[٤] تەفسیری ئاسان: ٤٠١.

[٥] تەفسیری ئاسان : ٤٥١.

[٦] تەفسیری ئاسان: ١٨٢.

[٧] تەفسیری ئاسان: ٥٥٥.

٨ ـ ﴿وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ﴾[(الأحزاب: ٣٥)].
واتــه: ((ئــەو پیــاوو ئافرەتانــەی كــەزۆر یــادی خــوا دەكەن..))[٨].

٩ ـ ﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِــهِمْ﴾ [(آل عمران: ١٩١)].
واته: ((ئەوانەی یادی خوا دەكەن لەكاتێكدا بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاكشاون))[٩]

١٠ ـ ﴿فَإِذَا قَضَيْتُمْ مَنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْراً﴾ [(البقرة: ٢٠٠)].
واته: ((جا هەر كاتێك ئەركو مەناسكەكانتان بەجێ هێنا ئەوكاتە یادی خوا بكەن هەروەكو چۆن یادی باووباپیرانتان دەكەن)))[١٠].

١١ ـ ﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِــنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ وَلا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ﴾ [(ال عمران:٢٠٥)].
واتــه: یــادی پــەروەردگارت لــەدڵو دەروونــی خۆتــدا بەلاڵانەوە ترەوە بكەو بێ دەنگ بەرزكردنەوە (لەنێوان چێشتەو

---

[٨] تەفسیری ئاسان: ٤٢٢.

[٩] تەفسیری ئاسان: ٧٥.

[١٠] تەفسیری ئاسان: ٣١.

ئاشکرادا) لەبەیانیان و دەمەو ئێوارانـدا ، لەبێئاگایان مەبە))[11]

١٢ ـ ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنْزِيلاً، فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلا تُطِعْ مِنْهُمْ آثِماً أَوْ كَفُوراً ، وَمِنَ اللَّيْلِ فَاسْجُدْ لَهُ وَسَبِّحْهُ لَيْلاً طَوِيلاً﴾[(الانسان:٢٦)].

واتە: (( دڵنیاش بە ئەی محمد(ﷺ) هەر ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاندوەو بەش بەش ، کەواتە خۆڕاگربە بۆ فەرمانی پەروەردگارت ، نەکەیت ملکەچ و فەرمانبەرداری تاوانباران و بێباوەڕان بیت ئینجا بەردەوام یادی پەروەردگارت بکەو ناوی پیرۆزی با ویردی سەرزارت بێت ، لەبەرەبەیان و دەمەو ئێواراندا، لەشەوگاریشدا سوژدەی بۆببەو تەسبیحات و ستایشی لەهەندێکی شەودا زۆربکە))[12].

١٣ ـ ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّداً وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لا يَسْتَكْبِرُونَ، تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ ، فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ [(السجدة:١٥ ـ ١٧)].

---

[11] تەفسیری ئاسان: ١٧٦.

[12] تەفسیری ئاسان:

واتە: (( بەڕاستی تەنیا ئەوانە بڕوا بەئایەتەكانی ئێمە دەهێنن ، كاتێك یاداوەری دەكرێن پێی ، خێرا سوژدە دەبەن تەسبیحات‌و سوپاسگوزاری پەروەردگاریان دەكەن، لەكاتێكدا ئەوانە بەهیچ شێوەیەك فیزیان نی‌یەو خۆیان بەگەورە نازانن، ئەو ئیمانداره بەختەوەرانە نێوانیان خۆش نیە لەگەڵ ڕاكشان لەجێگەو ڕێگەی گەرم‌و نەرما، هەمیشە نزاو پاڕانەوەیان ڕوو بەپەروەردگاریانە لەخەشم‌و قین‌و دۆزەخی دەترسن ئاواتی ڕەزامەندی‌و بەهەشتیان هەیەو لەو ڕزق‌و ڕۆزی‌و توانایی‌و زانیاریی‌یەی پێمان بەخشیوون دەبەخشن ، جا هیچ كەس لەو بەختەوەرانە نازانن چی بۆ هەڵگیراوەو شاراوەتەوە لەنازو نیعمەتی جۆراو جۆر لای پەروەردگاری ، كەچاوان پێی گەش دەبێتەوە بەدیتنی شاد دەبن، لەپاراستنی كاروكردەوەی چاك‌و پاكیاندا كەئەنجامیان دەدا))[١٣].

١٤ ـ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ، فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[(الجمعة:٩ ـ ١٠)].

---

[١٣] تەفسیری ئاسان: ٤١٦.

واتە: (( ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتیٚ کە بانگ درا بۆ نوێـژ لـەڕۆژی هـەینیدا، ئێـوە بەپەلـە بچـن بـەدەم یـادی خواوەو واز لـەکڕین‌و فرۆشـتن بـهێنن چونکـە ئـەو کارەتـان چاکترە ئەگەر بزانن‌و تیٚ بگەن، جاکاتێك نوێـژ تـەواو بـوو ئـەوە بلاٚوببنـەوە بـەزەویدا بەتـەمای بەخشیشـی خـوا هـەوڵ‌و کۆشش بدەن، یادی خـوا زۆر بکـەن لەهـەموو چالاکیـەکانی ژیـاندا بانـاوی ئـەو زاتـە لەسـەر زارو لـەناو دڵتـاندا بێـت ، بۆئەوەی سەرفرازی هەمیشەیی بەدەست بهێنن))[١٤].

١٥ ـ ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ [(طه:١٢٤)].

واتـە: ((ئەوەیش ڕوو وەربگێڕێت لەبەرنامەو یادی مـن‌و پشتی تـیٚ بکات، بێگومـان بـۆ ئـەو جۆرەکەسـانە ژیـانێکی تـرش‌و تـاڵ‌و نـاخۆش پێـش دێـت لـەڕۆژی قیامەتیشـدا بەکوێری حەشری دەکەین))[١٥].

---

[١٤] تەفسیری ئاسان: ٥٥٤.

[١٥] تەفسیری ئاسان: ٣٢٠.

# لەسوننەتی شیریندا

١ـ لە(ابی موسی)ی (اشعری)یەوە دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (نموونەی ئەو کەسەی یادی پەروەردگاری دەکات و ئەوەی یادی ناکات، بەچەشنی زیندوو مردو وان))[١٦].

٢ ـ لە (ابی الدرداء)وە دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئاخۆ باشترین و پاکترین کرداری خۆتان لای پەروەردگار پێ ڕانەگەیەنم کەوا پلەوپایەتان بڵند دەکات و ئەو کردارەش زۆر خێر هەڵگرە لەبەخشینی پارەو ئاڵتون و، باشترە لەوەی بگەن بە دوژمنەکانتان و بدەن لەگەردنی یەکدی ؟ یارانیش وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ؛ فەرمووی: ئەو کردارە زیکرو یادی پەروەردگارە))[١٧].

٣ ـ لە (ابوهریرە) لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((بەڕاستی بەتەنیا (مفردون ـ دەستپێشخەران یان پێشەنگان) سەرفرازبوون، یارانیش پرسیان: ئاخۆ کێ

---

(١٦) اخرجه البخاري.

(١٧) اخرجه الترمذي وابن ماجه وقال الحاكم (صحيح الأسناد).

بـن ئەوانــە ئــەی پێغەمبــەری خــوا؟ فــەرمووی: ئــەو پیاوئافرەتانەن کەوا زۆر یادو زیکری خوا دەکەن))[18].

٤ ـ لە (عبدالله)ی کوڕی (بسـر)ەوە دەگێڕنەوە ؛ دەڵێت: پیاوێك لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا وتـی: ئەی پێغەمبەری خـوا کـرداری چاکـەو دەروازەی خـێر زۆربـوون لەسـەرمو کردارێکم پێ بڵێ بیکەمو دەستبەرداری نەبم ، حەزرەتیش فـەرمووی: بـا هەمیشـە زوبـانت تـەڕو پـاراوبێت بـەیادی خوا))[19].

٥ ـ لە (انس)ەوە ـ رەزای خـوای لێبێت ـ دەگێڕنـەوە ؛ دەڵێـت: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرمووی: ((هـەرکات بـەلای باخچەکانی بەهەشتدا تێپەڕبوون ئەوا بـەئارامو هێمـن بـن، هـاوەڵانیش پرسـیان: باخچـەکانی بەهەشـت کامانـەن ئـەی پێغەمبـەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: ئەڵقـەو کـۆڕی یـادو زیکـر چونکە پـەروەردگار فریشتەی گـەڕۆکی هەیـە کـەوا بـەدوای کۆڕو ئەڵقەی زیکـردا دەگـەڕێن هـەرکات گەیشتن بـەو کۆڕانـە ئەوا لەدەوریان هەڵدەدەنو لایان دەسرەون))[20].

---

[18] أخرجه مسلم.

[19] رواه الترمذي وقال الحاكم صحيح الاسناد ووافقه الذهبي.

[20] في المسند والترمذي والبيهقي في شعب الايمان.

٦ ــ هەریەك لە (ابی سعید)ی (خدری)و (ابی هریرە) ـ رەزای خوایان لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە دەگێڕنەوە ؛ فەرموویەتی: ((هیچ گروهو كۆمەڵێك دانانیشن مەگەر فریشتەی پەروەردگار لایان دەسرەوون و سۆزو بەزەیش دادەبارێنن بەسەریانداو دڵئارامی ڕوویان تێدەكات، پەروەردگاریش لای فریشتە نزیكو باڵاكانی باسیان دەكات))[٢١].

٧ ــ لە (ابی هریرە)وە دەگێڕنەوە؛ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەوكەسەی لەجێگەو شوێنێك دابنیشێ و یادی خوای تێدا نەكات ئەوا دانیشتنەكەی دەبێتە مایەی ناتەواویی و ئاهو غەم بۆی ، ئەوەشی لەجێگەو شوێنێكدا پاڵ بكەوێت و یادی خوای تێدا نەكات بێگومان ئەو پاڵكەوتنە دەبێت بەمایەی كەم و كوڕی و ئاهو غەم بۆی))[٢٢].

٨ ــ (ابی هریرە) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)وە دەگێڕێتەوەو ئەویش لەپەروەردگارەوە دەفەرموێت: ((من هاوتای گومان و پەی بردنی بەندەكەمم ؛ خۆ ئەگەر یادیكردم ئەوا پاڵپشتی دەبم، هەركاتیش لەنەفسی خۆیدا یادی كردمەوە ئەوا لەنەفسی خۆمدا یادی

---

[٢١] رواه مسلم.

[٢٢] ابوداود وفي سلسلة الأحاديث الصحيحة للألباني.

دەکەم، گەرهاتوو لەنێو کۆڕو تاقمێکدا یادی کردم ئەوا لەنێو کۆڕو تاقمێکی باشتردا یادی دەکەم))[٢٣]

٩ ــ هەر لە (ابی هریرە)وە ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕنەوە ؛ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەوەی لەرۆژێکدا دەجار بلێت: (لا الهَ الاّ اللّهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ لَهُ الملك وَلَهُ الحَمْد وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدْير) ئەوا پاداشتی ئازادکردنی دە کۆیلەو سەد چاکەی بۆ دەنووسرێتو، سەد کرداری خراپو ناپەسەندیشی بۆ دەسڕێتەوەو، ئەو ڕۆژەش هەتا ئێوارە لەشەیتان بەدوورو پارێزراو دەبێت، هیچ کەسێیش کردارو رەفتارێکی لەوەباشتر ناکات مەگەر یەکێك زیاد لەوە ئەنجام بدات))[٢٤].

١٠ ــ هەر لە(ابی هریرە)وە ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕنەوە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( دوو وشە سووکن لەسەر زوبان بەلاّم لەنێو شایەنو کێشانەدا قورسو سەنگینن و ، لای پەروەردگاریش خۆشەویستن ؛ ئەو دوو وشەیەش : ((سُبْحَانَ اللهَ وَبِحَمْدِهِ ، سُبْحَانَ الله العَظيمَ))ە[٢٥]

---

[٢٣] متفق علیه.

[٢٤] رواه البخاري ومسلم.

[٢٥] رواه البخاري ومسلم.

١١ ــ (سمره)ی كوڕی (جندب) دەڵێت : پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (( خۆشەویسترین وتەو گوفتە لای پەروەردگار چوارن ، گەربێتو بەهەر كامیان دەست پێ بكەیت ئەوا زیانت پێناگات ، ئەو چوارەش بریتین لە: (سُبْحَانَ الله)((بێگەردیو پاكی بۆ خوا))و ، (الحَمْدُ للهِ) ((سوپاس بۆ خوا)و، (لاَ الَهَ الاّ الله) ((پەروەردگار تاكو تەنیایە))و، (واللهُ اكبر)) (پەروەردگار گەورەو بالاّیە))[٢٦].

١٢ ــ (ابو موسى)ی (اشعری) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پیّی وتم: رێنومایت بكەم بۆ گەنجینەیەك لەگەنجینەكانی بەهەشت؟ وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا؛ فەرمووی: بلێ: ((لاَحَوْلَ وَلاَ قُوَةَ الاّ بِاللهِ))، واتە: ((هیچ هێزو پەناو پشتگیرێك نیە جگە لە خوای گەورە))[٢٧].

١٣ ـ لە (جابر)ی كوڕی (عبدالله)وە ـ رەزای خوای لێبێت دەگێڕنەوە؛ دەڵێت:گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: ((باشترین یادو زیكری خوا وتنی: (لاَ اله الاّ الله) یە ))[٢٨].

---

[٢٦]اخرجه مسلم.

[٢٧] متفق عليه.

[٢٨] رواه الترمذي وابن ماجه.

١٤ ـ لە (انس)ەوە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕنەوە ؛ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەركەس جارێك بەیانیان و ئێواران بڵێ: [(اللهُمَّ اني اصْبَحْتُ أُشْهِدُك وَأشْهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ وَمَلائكَتِكَ وَجَميعِ خَلْقِك ، انَّكَ انْتَ اللهُ لاَ الهَ الاَّ انْت وَانَّ مُحَمَداً عَبْدُكَ وَرَسُولُك)]واتە: ((پەروەردگارا من گەواهی كردگاری تۆ دەدەم و گەواهیش بۆ هەڵگرانی كۆشك و فریشتە مەزنەكانی تۆ دەدەم لەگەڵ سەرجەم دروستكراوانی دی و بەتەنیا هەر تۆ پەروەردگاریت و (محمد)یش بەندەو پێغەمبەری تۆیە)) ئەوا خوای گەورە چواریەكی جەستەی لەئاگری دۆزەخ دەپارێزێت، ئەوەشی دووجار ئەم زیكرە بڵێت خوای گەورە نیوەی جەستەی قوتار دەكات لەئاگری دۆزەخ و ئەوەشی سێجار سێ بەشی جەستەیی و بێگومان ئەوەشی چوارجار بیڵێت پەروەرگار سەرجەم جەستەی قوتار دەكات لەئاگری دۆزەخ))[٢٩].

١٥ ـ لە (عبدالله)ی كوڕی (مسعود)ەوە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((قورئان سفرەو خوانی پەروەردگارە بۆیە ئێوەش ڕوو لەوسفرەو خوانە بكەن بەپێی توانای خۆتان ، لەڕاستیدا قورئان پەت و ڕایەڵەی خوایەو نورو ڕووناكیەكی بەرچاوەو

---

[٢٩] رواه الترمذي.

شیفاو چارەسەری بەسوودە، قورئان قەڵغانە بۆئەوانەی دەستی پێوە دەگرن و ڕێگەی سەرفرازیشە بۆئەوانەی شوێنی دەکەون و، خەوش و گەردێك نی یە ڕاینەماڵێ و هیچ لاریی و لەنگییەکیش نی یە ڕاستی نەکاتەوە، هەرگیز باس و ڕووداوە سەر سوڕهێنەرەکانی کۆن و دێرین نابن، بۆیە قورئان بخوێننەوە و پەروەردگار لەسەر خوێندنەوەی هەر پیتێکی دە چاکەتان بۆ دەنووسێت ؛ من ناڵێم : (الم) بەتەنیا یەك پیتە بەڵکو (ئەلف) پیتێکەو (لام) پیتێکەو (میم) پیتێکە))[٣٠]

## لەدیدی زانایاندا

١ ـ (ابن مسعود) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: ((گەربێتو چەند جارێك یادو زیکری خوا بکەم لەسەر دڵم خۆش و باشترە لەوەی بەئەندازەی ئەو یادوزیکرە پارەو دینار ببەخشم لەپێناوی خوادا)).

٢ ـ (أبوالدرداء) ـ ڕەزای خوای لێبێت . دەفەرموێت: ((سەرجەم بوون و پێکهاتەیەك خاوەن سەرچاوەی ڕووناکی و ئاسوودەیی خۆیەتی سەرچاوەی ڕووناکی و ئاسوودەیی دڵیش یادو زیکری خوایە)).

---

[٣٠] رواه الحاكم.

٣ ـ (ابـن تیمیـه) ـ رەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت: ((یادو زیکری خوا بۆ دڵ بەچەشنی ئاو بۆ ماسی وایە ئاخۆ حاڵی ماسی چۆن بێت لەکاتێکدا لەنێو ئاو بەدەر بکرێ)).

٤ ــ (ابـن تیمیـه) خـوای لێ ڕازی بێـت ــ دەفـەرموێت : لەدنیادا بەهەشتێك هەیە ئەوەی نەچێتە نێوی ئەوا ناچێتە نێو بەهەشتیشەوە ((مەبەستی چوونە دەروازەی یادو زیکری خوایـە)) یـەکێکیش کۆیلـەو دیلـە کـەوا دڵو دەروازەکـانی لەپـــەروەردگار دابخـــاتو ببێتـــە کۆیلـــەو دیلـــی حـــەزو ئارەزووەکانی)).

٥ ــ (ابـن قیـم)ی (جـوزی) ــ خـوای لێڕازی بێـت ــ دەفـەرموێت: (( یـادو زیکـری خـوا نـورو ڕووناکییـە بـۆ یادکـەرەوان هـەر لـەدنیاداو، نـورو ڕووناکیشـە لـەگۆڕداو، لـەڕۆژی زیندووبوونەوەشدا ڕووپۆشـی جەسـتەو باڵایـەتیو بەسەر پردی (صراط)دا پێوە ڕادەبوری، لەڕاستیدا دڵو گۆڕ ئەوەندی بەیادو زیکری خوا ڕۆشن دەبنەوە هیچ هۆکارێکی دی ئەوەندە ڕووناکیان ناکاتەوە)).

٦ ــ (مـالك)ی کـوڕی (دینـار) دەفـەرموێت: ((هیـچ کـات چێـژوەران تـامو چێژیـان وەرنـەگرتووە بەئـەندازەی چێـژ وەرگرتـن لـە یـادو زیکـری خـوا ، هیـچ ڕەفتـارو کردارێکیـش ئـەوەندەی یـادو زیکـری خـوا ئاسـانو چێـژ ئامێزو خۆشـنود نـییە بۆ دڵو دەروون)).

٧ ـ (ابن قیم) ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ لەکتێبی (الوابل الصیب)دا دەفەرموێت: ((بێگومان دڵ ژەنگ و ژاڵ دەیگرێت بەچەشنی مس و زیوو کانزاکانی دی، چارەسەریشی بەیادی خوا دێتە ئاراوەو پاکی دەکاتەوە هەتا وەك ئاوێنە سپی دەبێت ، هەرکاتیش دەستبەرداری یادو زیکری خوابوو دیسان ژەنگ و ژاڵ دەنیشێت لەسەری و هۆی ئەو حاڵەش دەگەڕێتەوە بۆ بێئاگایی و ئەنجامدانی تاوان، قوتاربوونیش لەوبارە بەداوای لێخۆشبوون و یادوزیکری خوا دەبێت.

بێگومان هەر مرۆڤێك سەرجەم ساتەکانی بەبێئاگایی بەسەربەرێت ئەوا ژەنگ و ژاڵ دەنیشێت لەدڵی و شوێنەوارەکەیشی بەئەندازەی ڕادەی بێئاگاییەکەی دەبێت، هەرکاتێکیش ژەنگ و ژاڵ دڵیان داپۆشی دیمەنی زانیاری و زانست بەپێچەوانەوە دەداتەوەو لەئەنجامدا نارەوا لەڕەنگی ڕاست و دروستدا بەدەردەکەوێت و بەپێچەوانەشەوە ؛ چونکە ئەو ژەنگ و ژاڵە بەچەشنێك دڵ دادەپۆشێ تاریك و چەتوونی دەکات و دیمەن و شێوەی ڕاستەقینەی ڕاستیەکان بەچەشنی خۆی بەدەر ناخات)).

٨ ـ هەندێك لەخواناسان دەفەرموون: ((داماوو بێنەوان خەڵکی دنیا، وامالئاواییان لەدنیاکرد بێئەوەی تام و چێژ وەربگرن لەخۆشترین بەرهەمی؟ هەندێکیش پرسیان: ئاخۆ

خۆشترین بەرهەمی دنیا چی بێت ؟! وتیان: خۆشەویستی پەروەردگار لەگەڵ ناسین و یادکردنەوەی)).

٩ ـ یەکێکی دی لەخواناسان دەفەرموێت: ((گەر بێتو پادشاو وەچەکانیان بەحاڵی ئێمە ئاشنابوونایە بێگومان لەپای ئەوەدا بەربەرەکانیان لەگەڵدا دەکردین بەشمشێر)).

((مەبەست بەوحاڵەش کەش و باری هێمنی نەفس و دەروونە کەلەرێگەی یادو زیکری خواو شەونوێژو بیرکردنەوە لەدروستکراوەکانیەوە وەبەردێت)).

١٠ ـ خواناسێکی دی دەفەرموێت: (( کاتێك بەندەکانی پەروەردگار یادوزیکری خوا دەکەنەوە لەزەوییەکی بچووکدان و قەبارەی خۆشیان زۆر لەزەوی بچووکترە، بەڵام یادی پەروەردگار بۆئەوان لەرووپاییەکی بەرفراوانی گەردووندایەو لەلایەن زاتی مەزنی خوای باڵاو گەورەوەیە ، ئەمەش چ رێزو دەستگوشادی و لێبوردەیی و بەخشندەییەکە...؟!)).

١١ ـ هەروەها دەفەرموێت: ((یادوزیکری پەروەردگار بەتەنیا بەزوبان نایەتەدی و واپێویست دەکات دڵ هاوتاو هاوپێچی بێت ، یان هەر دڵ خۆی وابەستەو بەندەواری بێت، هەستکردن بەبوونی پەروەردگارو کاریگەری لەسەر مرۆڤ بەلانی کەمەوە بەگوێڕایەڵی و خۆسپاردن دوایی دێت و، بەندە والێدەکات بەتەنیا پەروەردگار ببینێت و لەئەنجامیشدا

پەروەردگار تـامو چێـژی بەدیدار شادبوون دەهاوێتـە نێـو دڵی)).

١٢ ـ هـەروەها ـ خـوای لێ‌ڕازی بێـت ـ دەفـەرموێت: (( واژیام گوێ بیستی پەروەردگارەكەم بووم‌و وتووێژی لەگەڵدا دەكـردم لەڕێگـەی قورئانـەوە...منێكـی لاوازی بچـووك...چ ڕێزمەندییەكـە بـۆ مـرۆڤ ئـاوا دەسـتی ڕێـزی لێدەنرێـت لەبڵندگۆیەكی بەرزەوە؟ یان تەمەن چۆن بالأپۆشی مەزنی‌و بڵندی دەبێت بەم نیگایە؟ یاخود چ پلەوپایەیەكی ڕێزدارییە پەروەردگار بەخشیوویەتی بە مرۆڤ؟!)).

١٣ ـ هەروەها دەفەرموێت: (( ژیان لەژێر سایەی قورئاندا نیعمـەت‌و بەخششـە؛ نیعمـەت‌و بەخششـێكە ڕێـزو قـەدری نازانرێ مەگەر یەكێك چەشتبێتی، ئەو بەخشش‌و نیعمەتەیە كـەوا تەمـەن بڵنـد دەكـات‌و ئـاوێزانی بـەرگی پـیرۆزو پـاكی دەكات)).

١٤ ـ هەروەها (ابراهيم الحواص) ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ دەفـەرموێت: ((دەرمـانی دڵ بـە پێنـج هۆكـار بـەدی دێـت: خوێندنی قورئانی پیرۆز بەدڵ‌و ڕامان لەسەر ئایەتەكانی‌و، برسـێتی‌و سـك هەڵگوشـین‌و، شـەونوێژو، نزاوپاڕانـەوەی دەمەبەیان‌و، دانیشتن‌و هاوەڵایەتی پیاوچاكان)).

١٥ ـ خواناسـی (حمصـی) ـ خـوای لێ‌ڕازی بێـت ـ دەفـەرموێت: ((هـەرگیز وزەیـەكی چاك‌و باشترم وەك قورئـان

خوێندن بەدی نەكرد كەوا گەشەبدات بەعەقڵو ڕوحو، جەستەیش بپارێزێتو شادیو خۆشحاڵی بەبەریا بهێنێت)).

هەروەها دەفەرموێت: ((ئەو ساتەی تێیدا باوەڕدار رادەمێنێ لەجیهانی بیركردنەوەداو بیر لەمەزنی پەروەردگارو چۆنیەتی كردگارییەتی بۆ دروستكراوەكانی دەكاتەوەو غەمو پەژارەی دەڕەوێتەوە زیاترە لەچەند ڕۆژێكی خەڵكی بێئاگا لەكاتێكدا گوێبیستی دەنگی مۆسیقاو ئاوازی دڵفڕێن دەبن)).

## چەند سوودمەندیی یەك

١ ـ براو خوشكی موسوڵمان ؛ ئەی ئەوانەی پەروەردگار دایناون بەیادكەرەوانی خۆی: قورئانی پیرۆز یادو زیكرەو دەبینین پەروەردگار دەفەرموێت:﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ [(طـه:١٢٤)].واتە: ((ئەوەیش ڕوو وەربگێڕێت لەبەرنامەو یادی منو پشتی تێبكات، بێگومان بۆئەوجۆرە كەسانە ژیانێكی ترشو تاڵو ناخۆش پێش دێت ، لەڕۆژی قیامەتیشدا بەكوێری حەشری دەكەین))[٣١].

قورئانی پیرۆزیش بۆخۆی باشترین جۆری یادو زیكرە هەروەك لەسوننەتی شیریندا ئاماژەی پێكراوەو، سڵاواتدان

---

[٣١] تەفسیری ئاسان: ٣٢٠.

لـەدیاری پێغەمبـەریش لەڕیزبـەندی یـادو زیكردایـەو پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ [(الجمعة:٩)].

واتە: (( ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە كاتێ كەبانگ درا بۆ نوێـژ لـەڕۆژی هـەینیدا ئێـوە بەپەلـە بچـن بـەدەم یـادی خواوەو وازلـەكڕین‌و فرۆشتن بهێنن ؛ چونكـە ئـەو كارەتـان چاكترە بۆتان ئەگەر بزانن‌و تێبگەن))[٣٢].

لەڕاستیدا نوێـژ باشـترین جـۆری زیكـرو یـادی خوایـە چونكـە سـەرجەم بەندایەتی‌یـەكانی دی لـەقورئان خوێنـدن‌و جۆرەكـانی زیكـر ـــ تەسـبیحات‌و سـلاواتدان ـــ و سوپاسـگوزاری‌و دوعـاو نـزای لێخۆشـبوون‌و سـلاواتدان لـەدیاری پێغەمبـەر(ﷺ)ی تێدایـە، وێـڕای ناسـین‌و زانینـی حەلال‌و حەرام كەبەزیكرو یاد دەژمێردرێت‌و فێربوونت بۆ زانیاری بەسوودو بەگەڕخستنی لەبەرژەوەندی موسولمانانـدا زیكرو یادی خوایە، هەركاتیش خوازیاری ئەوەبوویت یـادو زیكـری خـوا لـەوادەی بێـداری‌و نووسـتن‌و ژیـان‌و مـەرگتا بكـەیت ئـەوا جێگیربـە لەسـەربەرنامەی پـەروەردگار هـەروەك فەرمانت پێدراوە.

---

[٣٢] تەفسیری ئاسان: ٥٥٢.

٢ ــ یادوزیكری خوا بەدلْو زوبان باشترە لەوەی دلْ بەتەنیا یادو زیكری خوا بكات، یادو زیكریش لەدلْدا زۆر باشترە لەیادو زیكرێك بەزوبان بكرێت.

٣ ــ یادو زیكری پەروەردگار بەهەماهەنگ بوون لەگەلْ ناوو سیفەتە جوانەكانیو داننان پێیدا پەسەندترە لەوەی زیكرو یاد لەدەروازەی داواو پێداویستیەكاندا بسوورێتەوە، هەر بۆیە لەفەرمودەیەكدا هاتووە پەروەردگار دەفەرموێت: ((ئەو بەندەیەی یادو زیكری من سەرقالْی كرد لەداواكردنی پێداویستیەكانی ئەوا زیاد لەوانەی پێدەبەخشم كەدەلاڵێنەوەو بەكولْ داوام لێدەكەن)).

لەبەرئەوە واباشە لەكاتی نزاوپاڕانەوەدا ئەوكەسەی دەپاڕێتەوە بەنواندنی سوپاسگوزاری بۆ خوای گەورە دەست پێ بكاتو سەناخوازی بۆ ئەو زاتە بەدەربخات ، پاشان داواكەی بخاتە ڕوو، لەدوعاو نزاكەی (ذنون )یشدا هاتووە یادو زیكر بەر لەدوعاكردن هاتە دیو دەفەرموێت: ﴿لا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾[(الانبياء: ٨٧)]واتە: ((پەروەردگارا هیچ خوایە نییە جگە لەتۆ پاكیو بێگەردی هەر بۆ تۆیە ، بەڕاستی من لەستەمكاران بووم))[٣٢].

---

[٣٢] تەفسیری ئاسان: ٣٢٩.

٤ ـ هەندێك جار واباشە گەر لەکەش‌و باری یادوزیکری خوادا ڕۆچووبوویت‌و حاڵێکی پێویست هاتە پێش‌و واپێویستی کرد ئەڵقەی یادو زیکرەکەت ڕابگریت‌و دواتر بگەڕێیتەوە سەری؛ وەك کاتێ سڵاویان ئاڕاستە کردیت وەڵامی سڵاوەکە بدەرەوەو ئەوجا بگەڕێرەوە سەر حاڵ‌و باری پێشووت، یاخود گەرهاتوو یەکێك پژمی وەڵامی بدەرەوەو پاشان بگەڕێرەوە سەر یادوزیکری خۆت، یاخود ئەگەر یەکێك بەناوی خۆتەوە بانگت بکات یان بۆ وەڵامدانەوەی تەلەفۆن یا گوێبیستی بانگ بوون‌و ...وەڵام بدەرەوەو دوایی بگەڕێرەوە سەر حاڵی یادو زیکری پێشووت، ئیدی لەسەر ئەم حاڵانە حاڵ‌و باری دیکەش بەهەند بگرە.

٥ ـ یادوزیکری خوای گەورە لەسەرجەم باورحاڵێکدا باش‌و پەسەندە مەگەر لەوکاتانەدا (شەرع) یاساغ‌و قەدەغەی کردووە وەك: کاتی دەست بەئاوگەیاندن‌و، دروستبوون لەگەڵ هاوسەرداو ، کاتی گوێ بیستبوون بۆ وتارو ، کاتی باوێشك‌و خەوە نوچکەو خەوبردنەوەو ...ئیدی لەسەر ئەم حاڵانەش دەتوانیت حاڵ‌و باری دیکە هەڵبسەنگێنی.

٦ ـ دروست‌و گونجاوە یادو زیکری خوا بکرێت بەدڵ‌و زوبان لەلایەن کەسێك تووشی لەشگرانی بووبێت یان ئەو ئافرەتانەی دەکەونە بێ‌نوێژی‌و زەیستانی، یادوزیکریش

سەرجەم سرووتەكانی سوپاسگوزاریو سلاٌواتدان لەدیاری پێغەمبەر(ﷺ)و ، گوزارشت كردن لەمەزنی پەروەردگارو نزاوپاڕانەوە دەگرێتەوە.

٧ ـ حەرامە خوێندنی قورئان بۆ كەسێك تووشی لەشگرانی بووبێت یان ئەو ئافرەتانەی دەكەونە بێنوێژیو زەیستانی، ئەگەر ئایەتێك یان چەند ئایەتێك بێت ، بەلاٌم ئەوانە دەتوانن لەدلٌیاندا قورئان بخوێنن بێئەوەی بەزوبان دەری ببڕن ، هەروەها دروستیشە بەچاو قورئان بخوێننو لەدلاٌ دووبارەی بكەنەوە.

٨ ـ دەگونجێت یادوزیكری خوا بكرێت بەهەر حالٌێك كەدێتە پێشەوە وەك بەپێوەو پالٌكەوتنو دانیشتنو رۆیشتنو سواربوون ، یاخود لەهەركاتێكدا دیاری بكرێت ، پەروەردگاریش سەناو باسی ئەوانەی كردووە لەحالٌو بارە جیاوازەكاندا یادوزیكری خوا دەكەن: ﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِهِمْ﴾[(آل عمران: ١٩١)]. واتە: ((ئەوانەی یادی خوا دەكەن لەكاتێكدا كەبەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاكشاون ))[٣٤].

---

[٣٤] تەفسیری ئاسان: ٧٥.

هەروەها خاتوو (عائشە)ی دایكی موسوڵمانان ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: (( پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەهەموو حاڵو بارێكدا یادو زیكری خوایدەكرد))[٣٥].

٩ ـ یادو زیكری خوا سوودی زۆر مەزنی لەخۆ گرتووە كەبەتەنیا پەروەردگار خۆی دەتوانێت دیاری بكاتو بیژمێرێت، پێشەوا (ابن قیم)ی (جوزی) لە كتێبی (الوابل الصیب)دا سەد سوود بۆ یادو زیكری خوا دەنووسێتو بۆ هەر سوودێكیش بەڵگە لەقورئانو سوننە دەهێنێتەوە. گەر خوازیاری شارەزابوونو زانیاری زیاتری لەیادوزیكرو سوودەكانی بگەڕێرەوە بۆ كتێبی ناوبراو لاپەڕەكانی: (٣٣-٨٦).

(٣٥) مسلم.

## بەشی دووەم

پلەو پایەی نزاو پاڕانەوە

چۆنیەتی و شێوازی پاڕانەوە

ئەوکاتانەی نزاو پاڕانەوەیان تێدا گیرا دەبێت

ئەوانەی نزاو پاڕانەوەیان گیرایە

سەرەتایەك بۆ نزاو پاڕانەوە

چەند نموونەیەك لەنزاو پاڕانەوە

لەقورئانی پیرۆزدا

لەسوننەتی پاك و بێگەردا

# پلەو پایەی نزاو پاڕانەوە لەقورئانی پیرۆزدا

١ـ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ [(البقرة:١٨٦)].

واتە: ((ئەی محمد(ﷺ) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێبکەن دەربارەم ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بەهاناو هاواری دۆعا گۆیانەوە دەچم هەرکاتێك لێم بپاڕێنەوەو نزابکەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێنو باوەڕی دامەزراو بەمن بهێنن بۆئەوەی ڕێگای هۆشیاریو ئاگایی بگرنەبەر))[1].

٢ ـ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعاً وَخُفْيَةً إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ، وَلا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفاً وَطَمَعاً إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ [(الأعراف:٥٥ـ٥٦)].

واتە: ((هاناو هاوار بکەن لەپەروەردگارتان بەپاڕانەوەی بەکوڵ بەنهێنی (لەکاتو شوێنی لەباردا) چونکە بەڕاستی ئەو زاتە دەستدرێژکارانی خۆش ناوێت، خەڵکینە فەسادو

---

[1] تەفسیری ئاسان: ٢٨.

گوناهو تاوان ئەنجام مەدەن لەزەویدا دوای ئەوەی چاکەکاریی ڕەنگی گرتووەو بەردەوام هاناو هاوار بۆ خوا بەرن لەترسی دۆزەخ و بەئومێدی بەدەستهێنانی بەهەشت بەڕاستی ڕەحمەتی خوا نزیکە لەچاکەکاران و چاکە خوازانەوە))[2].

٣ ـ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ [(غافر: ٦٠)].

واتە: ((ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆ من بهێنن، ئەوە من دوعاو نزاتان گیرادەکەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن و لووتبەرزی دەکەن لەئاستی پەرستنی مندا، لەئایندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتی‌یەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە))[3].

٤ ـ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ﴾ [(النمل:٦٢)].

واتە: ((ئایا کێیە جگە لەزاتی پەروەردگار کەبێت بەهاناو هاواری لێقەوماوو بێدەرەتان و بێدالدەوە، کاتێك نزا

---

[2] تەفسیری ئاسان: ١٥٧.

[3] تەفسیری ئاسان: ٤٧٤.

دەكـــاتو لێـــی دەپارێتـــەوە، ئەوســـا بـــەڵاو ناخۆشـــیەكان لادەباتو...))[٤].

٥ ـ پەروەدگار دەفەرموێت: ﴿لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّـــاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ، الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَـــا عَذَابَ النَّارِ، الصَّابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنْفِقِينَ وَالْمُسْـــتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ﴾ [(آل عمران: ١٥ ــ ١٧)].

واتـــــە: ((بۆئەوانــــــەی پارێزكـــــارو خواناســـــــن لای پـــەروەردگاریان باخـــەكانی بەهەشـــت ئامادەیـــە بۆیـــان كـــە: چـــــەندەها رووبـــــار بـــــەژێر درەختـــــەكانیداو بەبـــــەردەم كۆشكەكانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگـەڵ ژیانی نـەبڕاوە لەگـەڵ هاوســـەرانی پـــاكیزەداو بـــەدەم هەســـتكردنی بـــەردەوام بەڕەزامەندی پەروەردگاری ئازیز، بێگومان ئەو خوایە بینایە بەبەندەكانی ئەوانەی كەدەڵێن: پەروەردگارا؛ بەڕاستی ئێمـە ئیمـانو باوەڕمـان هێنـاوە، دەڵەگوناهـەكانمان خـۆش ببـەو لـەئاگری دۆزەخ بمانپـارێزە، جـا ئـەو ئیماندارانـە ئەمـە سیفەتیانە خۆگرو ئـارامگرن، ڕاسـتگۆو خواپەرسـتن مـاڵو ســـامان دەبەخشـــنو لەبەرەبـــەیاندا داوای لێخۆشـــبوون لەپەروەردگاریان دەكەن))[٥].

---

[٤] تەفسیری ئاسان: ٣٨٢.

[٥] تەفسیری ئاسان: ٥٢.

٦ ـ پەروەردگار دەفەرموێت:﴿وَاسْأَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّ اللَّـهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً﴾[(النساء:٣٢)].

واتە: ((بەردەوامیش داوای زیادە بەخشش‌و بەهرەی خوابکەن، چونکە بەڕاستی خوا بەهەموو شتێك زانایە))[٦].

## پلەوپایەی نزاو پارانەوە لەسوننەتی پاك‌و بێگەردد

لەسوننەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) فەرموودەی زۆرو بێ‌شومار هاتووە سەبارەت بەم باسە لەوانە:

١ ـ (ابن عمر) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی دەروازەی نزاوپاڕانەوەی لێ والاّ بكرێت ئەوا سەرجەم دەروازەكانی سۆزو بەزەیی بۆ خراوەتە سەرپشت ؛ خۆشەویسترین نزاو پاڕانەوەش لای پەروەردگار داوای بێوەیی‌و لەش ساغی‌یە ، بێگومان نزاوپاڕانەوە كاریگەرو بەسوودە لەسەر قەزایەك نازڵبوبێت یان نا ، بەتەنیا نزاوپاڕانەوەشە قەزاو چارەنووسی خوایی دەگێڕێتەوە ، بۆیە هەمیشە نزاوپاڕانەوە ئەنجام بدەن))[٧].

---

[٦] تەفسیری ئاسان: ٨٣.

[٧] اخرجه الترمذي.

٢ ــ (عبادة)ی کوڕی (صامت)ـ ڕەزای خـوای لێبێـت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هیچ موسـوڵمانێك نی‌یە لەسـەر زەویـداو نـزاو دوعـا لـەبارەگای پـەروەردگاردا بکـاتو پـەروەردگار داواکـەی بـۆ بـەجێ نەگەیەنێ یـاخود خراپەیەکی بەئـەندازەی داواکـەی لێدوور نەخاتەوە، بەمەرجێك نزاو دوعایەك نەبێت لەخانەی تاوانو سەرپێچی یان بچڕاندنی پەیوەندی‌و ڕایەڵەکانی خزمایەتیدا بێت))[٨].

٣ ــ (نعمان)ی کوڕی (بشیر) ــ ڕەزای خـوای لێبێـت . لەپێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) دەگێڕێتـەوە؛ دەفـەرموێت: ((نزاوپاڕانەوە بەندایەتی‌و پەرستشە، پاشان ئایەتی:﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِيـنَ يَسْـتَكْبِرُونَ عَـنْ عِبَـادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ [(غافر: ٦٠)]ی خوێندەوە))[٩].

٤ ــ (ابـی هریـره) . ڕەزای خـوای لێبێـت . لەپێغەمبـەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی نزاو پاڕانەوە نـەکات لەپـەروەردگار ئـەوا پـەروەردگار لێـی زویـرو تـوڕە دەبێت))[١٠].

---

[٨] رواه الترمذي.

[٩] اخرجه ابوداود.

[١٠] رواه الترمذي.

٥ ـ (ابن مسعود) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: (( هەمیشە داواکارو خوازیاری خێرو بەخششی خوایی بن ، چونکە پەروەردگار پێی خۆشە نزاو داوای لێ بکرێت ، بێگومان باشترین بەندایەتیش بریتیە لەچاوەڕێکردنی دەرووی خوایی))[١١].

٦ ـ (انس) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هەمیشە داوای سەرجەم پێداویستیەکانتان لەبارەگای پەروەردگارا بخەنە ڕوو تەنانەت گەر لایەکی نەعلەکانیشتان بچڕا داوای پێکەوە لکانی بکەن))[١٢].

---

[١١] رواه الترمذي.

[١٢] رواه الترمذي.

## مەرجەکانی نزاو پاڕانەوە

١)دەبێت خواردن و خواردنەوەو جل و بەرگت لەپارەو ماڵێکی حەڵاڵ و دروست پەیدا کردبێت.

٢)نابێت ئەو نزاو پاڕانەوەیەی دەیکەیت لەبازنەی گوناهو تاوان یاخود بچڕاندنی پەیوەندیو ڕایەڵەی خزمایەتیدا گیرسابێتەوە.

٣)دەبێت سەرەتاو کۆتایی نزاوپاڕانەوە بەسەناو سوپاسگوزاری نواندنی بەندە بۆ پەروەردگارو سڵاواتدان لەدیاری پێغەمبەر(ﷺ) دەست پێبکات و هەمیشە لەنێو نزاکاندا سڵاوات بدات لەدیاری پێغەمبەری خوا(ﷺ).

٤)دەبێت بەکوڵ و دڵ نزاوپاڕانەوە بکات و دڵنیاش بێت لەوەی پەروەردگار دێت بەهانایەوە.

٥)پەلەنەکردن لەوەڵامدانەوەی نزاوپاڕانەوەدا.

## بەڵگەکان

١ ـ دەبێت خواردن و خواردنەوەو جل و بەرگت لەپارەو ماڵێکی حەڵاڵ و دروست پەیداکردبێت:

(ابی هریرە) ــ ڕەزای خوای لێبێت. لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: (( خەڵکینە

پەروەردگارتان پاك‌و بێگەردەو ئەوەی پاك‌و بێگەرد نەبێت وەری ناگرێت لێتان، هەروەها ئەو فەرمانانەی داویەتی بەسەر بەندەباوەڕدارەکانیدا هەمان فەرمانە کەپێشتر بۆ پێغەمبەران (دروودی خوایان لێبێت) نازڵبووەو پێیان دەفەرموێت:﴿يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحاً إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ ،واتە: (ئەی گرۆی پێغەمبەران ، بخۆن لەرزق‌و رۆزیە چاك‌و پاکەکان، کاروکردەوەی چاکیش ئەنجام بدەن ، بەڕاستی من زانام بەهەموو ئەو کاروکردەوانەی کەدەیکەن)[١٣] ، هەروەها دەفەرموێت:﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بخۆن لەو رزق‌و رۆزیە چاك‌و باشانەی کەپێمان بەخشیوون)[١٤]، پاشان دوا سەبارەت بەپیاوێك لەسەفەرێکی تولانیدایەو قژبژو سەرووچاو تەپ‌و تۆزاویەو دەستی بڵند دەکاتەوە بۆ ئاسمان‌و پەروەردگارا ..پەروەردگارایەتی کەچی خواردن‌و خواردنەوەو جل‌و بەرگی حەرامەو جەستەی بەو حەرامە نەش‌و نمای کردووە ، ئیدی چۆن پەروەردگار دێت بەهانایەوە!؟))[١٥].

---

[١٣] تەفسیری ئاسان: ٣٤٥.

[١٤] تەفسیری ئاسان: ٢٦.

[١٥] رواه مسلم واحمد والترمذي.

٢ ـ نابێت ئەو نزاوپاڕانەوەیەی دەیکەیت لەبازنەی گوناهو تاوان یاخود بچڕاندنی پەیوەندیو ڕایەڵەی خزمایەتیدا گیرسابێتەوە:

ـ (عبادە)ی کوڕی (صامت) ـ ڕەزای خوای لێبێت. لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هیچ موسوڵمانێك نییە لەسەر زەویداو نزاوپاڕانەوەیەك لەقاپی پەروەردگاردا بكات مەگەر پەروەردگار وەڵامی دەداتەوە یاخود خراپەو قەزایەكی خراپی بەئەندازەی داواچاكەكەی لێدوور دەخاتەوە بەمەرجێك ئەو دوعایەی دەیكات لەبازنەی گوناهو تاوانو بچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتیدا نەبێت))[١٦].

٣ ـ دەبێت سەرەتاو كۆتایی نزاو پاڕانەوە بەسەناو سوپاسگوزاری نواندنی بەندە بۆ پەروەردگارو سڵاواتدان لەدیاری پێغەمبەر(ﷺ) دەست پێبكاتو هەمیشە لەنێوان نزاكانیدا سڵاوات بدات لەدیاری پێغەمبەری خوا(ﷺ):

ـ (فضالە)ی كوڕی (ابی عبید). ڕەزای خوای لێبێت. لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێی لێبوو پیاوێك نزای دەكرد دوای نوێژەكەی سڵاواتی نەدا لەدیاری پێغەمبەر(ﷺ) پاشان فەرمووی: ئەو پیاوە پەلەیكرد، دواتر بانگی كردو پێی

[١٦] رواه الترمذي.

فەرموو: هەرکات نوێژتانکرد ئەوا بەسوپاسگوزاری خواو ستایشکردنی دەست پێبکەنو ئەوجا سەلاوات بدەن لەدیاری پێغەمبەرو دوایی هەر نزاو داویەکتان هەبوو بیکەن))[17].

ـ هەروەها(ﷺ) دەفەرموێت: ((نزاوپاڕانەوە لەنێوان ئاسمانو زەویدا گیردەخواتو بەرزنابێتەوە هەتا سەلاوات نەدرێت لەدیاری من ؛ بۆیە داواتان لێدەکەم مەمکەن بەو شوولەی وا بەدەستی سوارچاکەوە (واتە هەرکات لەولاخەکەی دا ئەوجا دەکەوێتە ڕێ)، سەلاوات بدەن لەدیارم لەسەرەتای نزاو پاڕانەوەو ناوەڕاستو کۆتاییدا))[18].

٤ ـ دەبێت بەکولو دڵ نزاو پاڕانەوە بکاتو دڵنیشا بێت لەوەی پەروەردگار دێت بەهانایەوە:

ـ پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَباً وَرَهَباً وَكَانُواْ لَنَا خَاشِعِينَ﴾[(الانبياء: ٩٠)].

واتە: ((بەڕاستی ئەوانە چالاكو گورجو گوڵ بوون لەئەنجامدانی هەموو خێروچاکەیەکداو نزای بەکوڵیان دەکرد، بەئومێدی ڕەحمەتو بەهەشتی ئێمەو لەدۆزەخو خەشمی ئێمە دەترسانو ئەوان هەمیشە گەردن کەچ بوون بۆ ئێمە))[19].

---

[17] اخرجه اصحاب السنن.

[18] اخرجه الترمذي.

[19] تەفسیری ئاسان: ٣٢٩.

**ـ هەروەها لەسوننەتی پاك و بێگەردی پێغەمبەریشدا هاتووە:**

ـ (ابی هریره) . رەزای خوای لێبێت . لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((کاتێ نزاوپاڕانەوەتان کرد لەبارەگای پەروەردگار ئەوا دڵنیابن پەروەردگار دێت بەهاناتانەوەو ئاگاداری ئەوەش بن هەرگیز پەروەردگار نزاو پاڕانەوەی یەکێك وەرناگرێت دڵی بێئاگا بێت لەبارەگای خوا))[20].

٥ ـ پەلەنەکردن لە وەڵامدانەوەی نزاو پاڕانەوەدا:

ـ (ابی هریره) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: (( پەروەردگارتان دێت بەهانای نزاوپاڕانەوەتان گەر پەلەنەکەن و سکاڵانەکەن و بڵێن: نزاوپاڕانەوەم کرد لای پەروەردگار بەڵام نەهات بەهانامەوە))[21].

---

[20] رواه الترمذي.

[21] متفق عليه.

# شێوازو چۆنیەتی نزاو پاڕانەوە

١ ـ ئاڕاستەو رووکردنە قیبلە.
٢ـ بەرزکردنەوەی لەپی دەست لەکاتی نزاوپاڕانەوەدا.
٣ ـ بەرزکردنەوەی هەردوو دەست بەچەشنێك سپێتی ژێربالْ دەربکەوێت.
٤ ـ ڕاگرتنی هێمنیو دەنگ بەرزنەکردنەوە بەدەم نزاو پاڕانەوەوە.
٥ ـ گەر نزاو پاڕانەوە بۆ یەکێکی دیکە بوو با لەنەفسی خۆیەوە دەست پێبکات.
٦ ـ نابێت نزای شەڕ بکات لەخۆیو ماڵو منداڵی.
٧ ـ هەڵبژاردنی نزای کورتو کاریگەر.
٨ ـ سێجار دووپاتکردنەوەی نزاو پاڕانەوەیەك.
٩ ـ دڵنیابوون لەگیرابوونی نزاو پاڕانەوە.
١٠ ـ کۆتایی هێنان بەهەریەك لەو نزاو پاڕانەوانە بە وشەی (ئامین).

# بەڵگەکان

١ ــ ئاڕاستەوە ڕووکردنەوە قیبلە:

ـ (جابر)ی کوڕی (عبدالله) لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا لەمەیدانی (عرفە)لایداو ڕوویکردە قیبلەو بەردەوام نزاو پاڕانەوەی دەکرد هەتا خۆر ئاوابوو)).

٢ ــ بەرزکردنەوەی لەپی دەست لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا:

ـ (ابن عباس) ـ ڕەزای خوای لێبێت . لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((دەست مەنوقێنن هەرکەس بێ وەرگرتنی مۆڵەت لەبرایەکی موسوڵمانی بڕوانێ بۆ نوسراوو دەستنوسێکی وەك ئەوە وەهایە تەماشای ئاگری دۆزەخی کردبێت ، داواتان لێدەکەم کاتێ نزاو پاڕانەوەتانکرد بەلەپی دەست بپاڕێنەوەو پشتی دەست ئاڕاستە مەکەن، هەرکاتیش لێبوونەوە دەستان بهێنن بەدەموچاوتاندا))[٢٢].

---

[٢٢] اخرجه ابوداود.

٣ـ بەرزكردنەوەی هەردوو دەست بەچەشنێک پێستی ژێربالْ دەربكەوێت:

-(انس) - رەزای خوای لێبێت . سەبارەت بەنزاوپاڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەكاتی نزاوپاڕانەوەدا هەردوو دەستی بڵند دەكردەوە بەچەشنێك هەتا سپێتی ژێربالْی دەردەكەوت و هەرگیز بەپەنجە ئاماژەی نەدەكرد)).

٤ ـ ڕاگرتنی هێمنی و دەنگ بەرزنەكردنەوە بەدەم نزاوپاڕانەوە:

ـ (ابو موسى) ـ رەزای خوای لێبێت . لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: لەسەفەردا بووین لەخزمەت پێغەمبەری خواو خەڵكی بەدەنگی بەرزوبڵند دەستیانكرد بە(الله اكبر) ؛ پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: ((خەڵكینە ڕەحمێ بەنەفسی خۆتان بكەن، ئێوە زاتێكی كەڕو نادیار بانگ ناكەن و پەروەردگارێك بانگ دەكەن بیسەرو بینەرەو هەمیشە لەگەڵتاندایەو نزیكترە لە(ڕێشمەی ولاْخەكەتان))[٢٣].

---

[٢٣] رواه الخمسة الا النسائي.

**٥ ــ گەر نزاو پاڕانەوە بۆ یەكێكی دیكەبوو بالەنەفسی خۆیەوە دەست پێبكات:**

ـ (ابی)ی كوڕی (كعب) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ سەبارەت بەنزاوپاڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: هەركات پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزاوپاڕانەوەی بۆ یەكێكی دیكە بكردایە ئەوا بەنەفسی خۆی دەستی پێدەكرد))[٢٤].

**٦ــ نابێت نزای شەڕبكات لەخۆیو ماڵو منداڵی:**

ـ (جابر) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هەرگیز نزاو دوعای شەڕ مەكەن دژ بەخۆتانو ماڵو منداڵو بەردەستتان ، نەبادا لەوكاتەدابێت پەروەردگار نزاو دوعا گیرا دەكات))[٢٥].

**٧ ــ هەڵبژاردنی نزای كورتو كاریگەر:**

ـ خاتوو (عائشە)ی دایكی موسوڵمانان ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ سەبارەت بەنزاو دوعای پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ((هەمیشە پێغەمبەری خوا ئارەزوومەندی نزاوپاڕانەوەی كورتو كاریگەربوو و بەدەر لەوەی نەدەكرد)).

---

[٢٤] رواه الترمذي.

[٢٥] اخرجه ابوداود.

**٨ ـ سێجار دووپاتکردنەوەی نزاو پاڕانەوەیەک:**

.(ابـن مسـعود) . ڕەزای خـوای لێبێـت . سـەبارەت بەنزاوپاڕانـەوەی پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت: ((هەمیشـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) سـێجار نزاوپاڕانەوەکـەی دووپـات دەکـردەوەو هـەرجارێکیش داوای لێخۆشـبوونی بکردایـە بەهەمان شێوە سێجار دووپاتی دەکردەوە)).

**٩ ـ دڵنیابوون لەگیرابوونی نزاوپاڕانەوە:**

ـ (ابـی هریـره) . ڕەزای خـوای لێبێـت . لەپێغەمبـەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((هیچ کەسێك لەئێوە لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا نەڵێت: پەروەردگارا ؛ گەر ویستت لێم ببورەو بەزەیت بەحاڵمدا بێتەوە، بەڵکو با پشت ئەستور بێت لەنزاو پاڕانەوەکەیداو جەختی لەسەربکات چونکە پەروەردگار زۆرو فشاری لێناکرێت))[٢٦].

**١٠ ـ دوایی‌هێنان بەهەریەک لەونزاو پاڕانەوانە بەوشەی (ئامین):**

- (ابوزهیر)ی (نمری) - ڕەزای خوای لێبێت . دەفەرموێت: شـەوێك بـەیاوەری پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هاتینـە دەرەوەو چاومان کەوت بەپیاوێك بەکوڵ دەپاڕایەوەو نـزای دەکـردو پێغەمبـەری خـواش(ﷺ) ڕامـاو گوێبیسـتی نزاکـانی بـوو،

---

[٢٦] اخرجه ابوداود.

پاشان فەرمووی: قبولّو پەسەندە گەر دوایـی پیّبـهێنێت، یارانیش پرسیان: بەچی دوایی پیّ بهێنێت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: بە(ئامین) ، پاشان پیاوەکەی بەجێهێشتو یارانیش بەپیاوەکەیان وت بەئامین دوایی بەنزاکانی بهێنێتو مژدەی قبوولّ بوونیان پێدا))[27].

[27] رواه ابوداود.

## باشترین کاتو وادە بۆ گیرابوونی نزاوپاڕانەوە

١ ـ شەوی قەدر.
٢ ـ رۆژی عەرەفە.
٣ ـ لەکاتی سەرکەوتن بۆ صەفاو مەروەدا.
٤ ـ لەکاتی تەواف کردن لەنێوان صەفاو مەروەدا.
٥ ـ لەکاتی خواردنەوەی ئاوی زەمزەمدا.
٦ ـ دە رۆژ لەمانگی (ذي الحجة)
٧ ـ مانگی رەمەزان.
٨ ـ کاتی بەربانگ بۆ رۆژوەوان.
٩ ـ لەکاتی بانگداندا.
١٠ ـ لەنێوان بانگو قامەتدا.
١١ ـ لەکاتی کڕنووش بردندا.
١٢ ـ لەسێیەکی کۆتایی شەودا.
١٣ ـ لەدوای هەموو نوێژێکی فەرزدا.
١٤ ـ رۆژی هەینی (جمعة)
١٥ ـ ساتێکی تایبەت لەهەینیدا.
١٦ ـ لەگەرمەی جەنگدا (کاتی تێکرژان).
١٧ ـ لەکاتی بارانبارینددا.
١٨ ـ لەکاتی قورئان خوێندنو خەتم کردنیدا.
١٩ ـ لەکۆڕی یادو زیکری خوادا.

# بەلگەکان

**١ ـ شەوی قەدر:**

ـ(ابی هريره) ـ رەزای خـوای لێبێـت ـ لەپێغەمبـەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی شەوی قەدر زیندوبکاتـەوە بـەیادو زیکـری خـوا پـەروەردگار لـەگوناهی پێشووی دەبورێت))[٢٨]

ـ هەروەها خاتوو (عائشە)ی دایکی موسوڵمانان ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پرسیم لەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ) گـەر بـۆم دەرکـەوت شـەوی قـەدر کەیـە ئـاخۆ چـی بڵێـم لەوشەوەدا ئەی پێغەمبەری خوا؟ لەوەڵامدا فەرمووی: ((بڵـێ پـەروەردگارا تۆ لێبوردەیتو لێبوردنت پێخۆشە ؛ داواکارم لەبارەگای پیرۆزت لێم ببوریت))[٢٩].

**٢ ـ رۆژی عەرەفە:**

ـ خـاتوو (عائشە)ی دایکی موسوڵمانان ـ رەزای خـوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هیچ رۆژێك نـیـە پـتر لـەرۆژی عەرەفـە پـەروەردگار بـاڵی سۆزو بەزەییو لێخۆشبوونی رابخاتو گەردنی بـەندەکانی

---

[٢٨] رواه البخاري ومسلم.

[٢٩] رواه احمد وابن ماجه والترمذي.

لەئاگری دۆزەخ قوتار بكات‌و لێیان نزیك ببێتەوە، پاشان شانازییان پێوەبكات لای فریشتەكانی‌و لەداواكانیان بپرسێت؟))[٣٠].

ـ هەروەها (جابر) ی كوڕی (عبدالله) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: لەڕۆژی (عەرەفە)دا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هات بۆ گۆڕەپانی عەرەفەو ڕووەو قیبلە وەستا، پاشان بەردەوام بەكوڵ نزاو پاڕانەوەی دەكرد هەتا خۆر ئاوابوو)).

### ٣ ــ لەكاتی هەڵكەڕان بە (صەفاو مەروە)دا:

لەڕەفتارەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەوڕۆژەدا دوای ئەوەی لەدەروازەی (صەفاو مەروە) بەدەركەوت ئەوجا ئایەتی:﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ ﴾ی دەخوێندو دەیفەرموو: ((بەوچەشنەی پەروەردگار دایناوە دەست بەكار دەبم، پاشان هەڵدەگەڕا بە(صەفاو مەروە)دا هەتا (بیت)ی لێ بەدەردەكەوت ئنجا ڕوویدەكردە قیبلەو (لا الـه الا الله)و (الله اكبر) ی سێجار دەوت‌و ، پاشان ستایشی پەروەردگاری دەكردو دەیفەرموو: ((پەروەردگارا تۆ تاك‌و تەنیایت‌و هیچ هاوەڵێكت نی‌یەو گەنجینەی دەستەڵات‌و سوپاسگوزاری‌و مەرگ‌و ژیان هەمووی بەدەستی تۆیەو هەموو شتێك هەر لەژێر دەستی تۆدایەو بەتەنیا هەر تۆ پەروەردگاریت‌و،

---

[٣٠] رواه مسلم وغيره.

بەڵێنی خۆت بەجێگەیاندو کۆمەڵو گرۆی خوانەناسانت شکستو ملکەچ کرد، ئنجا لەونێوانەدا هەمان نزای دەکردو سێجار دووپاتی دەکردەوە ، پاشان دادەبەزیو بەپێ دەچوو بۆ (مروە) هەتا دەگەییە ئەوێ، هەڵدەگەڕا بە(مروە)شدا هەتا (بیت) بەدەردەکەوتو هاوچەشنی (صەفا) ویردو ڕێورەسمەکانی دووپات دەکردەوە)).

## ٤ ــ لەکاتی تەوافکردن لەنێوان (صەفاو مەروە)دا:

ـ (سید سابق) لەکتێبی (فقه السنة)دا دەڵێت: (واباشە نزاو پاڕانەوە بکرێت لەنێوان صەفاو مەروەداو ، یادوزیکرو قورئان خوێندیش کارێکی گونجاوو باشەو لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕنەوە لەهاتووچۆی نێوان (صەفاو مەروە)دا فەرموویەتی: پەروەردگارا ؛ بمبوورەو بەزەیت بەحاڵمدا بێتەوەو ڕێنموییم بکە بۆ شەقامە ڕێی ڕاستو ڕەوان)).

## ٥ ــ لەکاتی خواردنەوەی ئاوی زەمزەمدا:

ــ (سید سابق) لە(فقه السنه)دا دەڵێت: دوای خواردنەوەی ئاوی زەمزەم واباشە نزاوپاڕانەوە بکرێت لەنێوان (رکن)و (باب)داو (بیهقی) لە(ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: لەنێوان (باب)و (رکن)دا ڕادەماو بەونێوانەی دەوت: (ملتزم)و هەرکەس لەویادا نزاو دوعابکات لەبارەگای پەروەردگار بێگومان پێی دەبەخشێتو نائومێدی ناکات)).

### ٦ ـ دە رۆژ لەمانگی (ذي الحجة):

ـ (ابن عباس) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هیچ رۆژێك نییە لای پەروەردگار بەچەشنی ئەم رۆژانە كردارو رەفتاری چاك تێیدا باش بێت)) یارانیش پرسیان: ئەی پێغەمبەری خوا لەتێكۆشان و جیهادیش لەپێناوی خوادا باشترە؟ فەرمووی: تێكۆشان و جیهادیش پێی ناگات مەگەر یەكێ بەسەروماڵەوە بەرێ كەوتبێت و هەمووی لەپێناوی خوادا دانابێت))[٣١].

### ٧ ـ مانگی رەمەزان:

پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ..( هەتا )وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ﴾ [(البقرة:١٨٥ ـ ١٨٦)] ،هەروەها دەفەرموێت: ((ئەوەی مانگی رەمەزان بەرۆژو بێت بۆ خواو بەهیوای ئەجرو پاداشت بێت پەروەردگار لەگوناهی پێشووی دەبووریت))[٣٢].

### ٨ ـ كاتی بەربانگ بۆ رۆژووەوان:

ـ(ابن ابی ملیكە) لە(عبدالله)ی كوڕی (عمر)ەوە ـ رەزای خوایان لێبێت ـ دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت:گوێم لێبوو

---

[٣١] رواه الجماعة الا مسلماً والنسائي.

[٣٢] رواه أحمد وأصحاب السنن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: ((نزاوپاڕانەوەی ڕۆژووەوان لەکاتی بەربانگدا گیرایە)).

## ٩ ـ لەکاتی بانگداندا:

ـ (سەهل)ی کوڕی (سعد) لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرمویێت: (( دوو کات نزاوپاڕانەوەی تێدا گیرایە ؛ نزاو پاڕانەوە لەکاتی بانگدان لەگەڵ نزاوپاڕانەوەی کاتی سەغڵەتی و تەنگ پێ هەڵچنینی یەکدی لەجەنگدا))[٣٣].

## ١٠ ـ لەنێوان بانگ و قامەتدا:

ـ (انس) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرمویێت: ((نزاو پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت گیرایە))[٣٤].

## ١١ ـ لەکاتی کڕنووش بردندا:

ـ (ابی هریرە) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرمویێت: ((نزیکترین سات و وادەیەك تێیدا بەندە لەپەروەردگارەکەیەوە نزیك بێت کاتی

---

[٣٣] رواه أبوداود باسناد صحيح.

[٣٤] رواه أبوداود والنسائي والترمذي وقال حديث حسن صحيح.

کڕنــووش بردنــە، بۆیــە لــەکاتی کڕنــووش بردنــدا پــتر نزاوپاڕانەوە بکەن))[٣٥].

## ١٢ ـ لەسێیەکی کۆتایی شەودا:

ـ(ابی هریرە) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: (( هەموو شـەوێك پـەروەدگار لەسێیەکی کۆتـایی شـەودا دادەبەزێت بۆ ئاسمـانی دنیـا ؛ کـاتێ سـێیەکی شـەو ڕادەبوڕێـتو دەفـەرموێت: کـێ نـزاو پاڕانـەوەی هەیە هـەتا وەڵامـی بدەمەوەو کێداوایـەکی هەیـە بیدەمــێو کێــش داوای لێخۆشــبوون دەکــات بــالێیی ببورم))[٣٦].

## ١٣ ـ لەدوای هەموو نوێژێکی فەرزدا:

ـ (ابـی امامـە) ـ رەزای خـوای لێبێـت . لەپێغەمبـەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: پرسیان لەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کـام نزاوپاڕانـەوە گیرایـە؟ فـەرمووی: لەسـێیەکی کۆتایی شەوداو لەدوای هەموو نوێژێکی فەرزەوە))[٣٧].

---

[٣٥] مسلم وابوداود والنسائي.

[٣٦]رواه البخاري ومسلم ومالك والترمذي.

[٣٧]رواه الترمذي وقال حديث صحيح.

**١٤ ـ ڕۆژی هەینی:**

ـ (ابی هريره) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: (( لەڕۆژی هەینیدا کاتێکی تێدایە گەر بەندەی موسوڵمان پێی بگات لەوکاتەوە ڕاوەستاوە نوێژ دەکات ئەوا هەر داوایەك لەپەروەردگاری خۆی بکات پێی دەبەخشێ، پاشان بەدەستی ئاماژەی بە کورتی ئەو ماوەیەکرد))[٣٨].

**١٥ ـ ساتێکی تایبەت لەهەینیدا:**

ـ (ابی سعيد) و (ابی هريره) ـ ڕەزای خوایان لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕنەوە؛ دەفەرموێت: (( ڕۆژی هەینی ساتێکی تایبەتی تێدایە گەر بەندەی موسوڵمان پێی بگاتو تێیدا نزاوپاڕانەوە لەپەروەردگارەکەی بکات ئەوا خێروچاکەی دەداتێو ، ئەوساتەش دوای عەسرە))[٣٩].

**١٦ ـ لەگەرمەی جەنگدا (کاتی تێکـوڕان لەگەڵ دوژمنانی ئاینی خوادا).**

**١٧ ـ لەکاتی باران باریندا:**

ـ (سعيد) . ڕەزای خوای لێبێت . لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: (( دوو نزاو پاڕانەوە گیرایە ،

---

[٣٨] متفق عليه.

[٣٩] رواه أحمد وقال العراقي صحيح.

نزاوپاڕانەوە لەکاتی بانگداو ، نزاوپاڕانەوەش لەکاتی ناڕەحەتی‌و تێکڕژان لەگەڵ دوژمندا(لەگەرمەی جەنگدا))[٤٠].

### ١٨ ــ لەکاتی قورئان خوێندن‌و خەتم کردندا:

-(ابن ابی داود) بەدوو (سند)ی (صحیح) لە(قتادە)ی (تابعی) هاوەڵی (انس)ەوە دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: هەرکات (انس)ی کوڕی (مالك) خەتمی قورئانی پیرۆزی بکردایە خاووخێزانی کۆدەکردەوەو بەکوڵ نزاوپاڕانەوەی دەکرد).

### ١٩ ــ لەکۆڕی یادو زیکری خوادا:

-(ابی سعید) ی (خدری) و (ابی هریرە) . ڕەزای خوایان لێبێت . لەپێغەمبەری خواوە دەگێڕنەوە ؛ فەرموویەتی: ((هەر کۆمەڵ‌و تاقمێك کۆببنەوەو یادو زیکری خوا بکەن فریشتەکان دەوریان دەدەن‌و سۆزو میهرەبانی‌و دڵئارامی دەبارێت بەسەریانداو پەروەردگاریش لای فریشتە بالأکانی یادی ئەو بەندانە دەکاتەوە))[٤١].

---

[٤٠] اخرجه مالك وأبوداود وفي رواية تحت المطر(لە ڕوایەتێکی دیکەدا بەدەستەواژەی : لەژێر باراندا هاتووە) .

[٤١] رواه مسلم.

# ئەوانەی نزاو پاڕانەوەیان گیرایە

١ ـ ستەملێكراو .

٢ـ ئەوەی لەسەفەردایە.

٣ ـ نزاو پاڕانەوەی باوك بۆ وەچەكەی.

٤ ـ نزاو پاڕانەوە بۆ یەكێك بە پەنهانیو نهێنی.

٥ ـ نزاو پاڕانەوەی ڕۆژوەوان.

٦ ـ پێشەوای داد پەوەر.

٧ ـ سەغلەتو زۆر بۆهاتوو.

٨ ـ نەوەی سالْحو باش بۆ باوكو دایكی.

٩ ـ تەوبەكارو پەشیمان لەگوناهو تاوان.

١٠ ـ موسوڵمان.

# بەڵگەکان

١ ـ ستەملێکراو :ئەگەر بێباوەڕو خراپەکاریش بێت.

٢ ـ نەوکەسەی لەسەفەردایە: بەمەرجێك سەفەرەکەی لەسەرپێچی پەروەردگاردا نەبێت.

٣ ـ نزاوپاڕانەوەی باوك بۆ وەچەکەی:

(ابی هریره). رەزای خوای لێبێت. لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: (( سێ نزاوپاڕانەوە لای پەروەردگار گیرایەو رەدناکرێتەوە، نزاوپاڕانەوەی ستەملێکراوو ئەوەی لەسەفەردایەو ، لەگەڵ نزاوپاڕانەوەی باوك بۆ وەچەکەی))[٤٢].

٤ ـ نزاوپاڕانەوە بۆ یەکێك بەپەنهانی:

ـ (عمرو)ی کوڕی (عاص). رەزای خوای لێبێت. لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((هیچ نزاو پاڕانەوەیەك نییە خێرا گیرابێت بەئەندازەی ئەو نزاوپاڕانەوەیەی بەپەنهانی بۆ یەکێك دەکرێت))[٤٣].

---

[٤٢] ابوداود والترمذي.

[٤٣] الترمذي وابوداود.

**٥ ـ نزاوپاڕانەوەی ڕۆژووەوان.**

**٦ ـ پێشەوای دادپەروەر:**

ـ (ابی هريره) ـ ڕەزای خوای لێبێت. لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((سێ چین و کۆمەڵ نزاو پاڕانەوەیان گیرایە: ڕۆژووەوان هەتا بەربانگ دەکاتەوە، پێشەوایەکی دادپەروەر لەگەڵ نزاوپاڕانەوەی ستەملێکراو))[٤٤].

**٧ ـ سەغڵەت و زۆربۆهاتوو:**

پەروەردگاری مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ ﴾[(النمل:٦٢)].

واتە: ((ئایا کێیە جگە لەزاتی پەروەردگار کەبێت بەهاناو هاواری لێقەوماوو بێدەرەتان و بێدادە، کاتێك نزا دەکات و لێی دەپاڕێتەوە، ئەوسا بەلاو ناخۆشیەکان لا دەبات و..))[٤٥].

**٨ ـ نەوەیەکی ساڵح و باش لەگەڵ باوك و دایکیدا.**

**٩ ـ تەوبەکارو پەشیمان لەگوناهو تاوان:**

ـ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُوراً رَحِيماً﴾ [(النساء:١١٠)].

---

[٤٤] قال الترمذي حديث حسن.

[٤٥] تەفسیری ئاسان: ٣٨٢.

واتە: ((ئەوەی خراپەیەك بكات یان ستەم لەخۆی بكاتو داوای لێخۆشبوون لەخوا بكات ، ئەوە خوایەكی لێخۆشبوو میهرەبانی دەستدەكەوێت))[٤٦].

١٠ ــ نزاوپاڕانەوەی موسوڵمان گیرایە بەمەرجێك پێچەوانەی مەرجی نزاوپاڕانەوە نەبێت ؛ هەروەك پەروەردگار ئاماژەی پێداوەو دەفەرموێت:﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾واتە: ((ئەی محمد(ﷺ) ئەگەر بەندەكانم پرسیارت لێبكەن دەربارەم، ئەوە من نزیكم لێیانەوە، بەهاناو هاواری دۆعاگۆیانەوە دەچم هەركاتێك لێم بپاڕێنەوەو نزابكەن))[٤٧].

هەروەها (ابوسعید) . ڕەزای خوای لێبێت . لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((هەر موسوڵمانێك لەبارەگای پەروەردگار نزاو پاڕانەوە بكات بەمەرجێك نزای شەڕو خراپەو بچڕانی ڕایەڵەو پەیوەندی خزمایەتی نەبێت نزاكەی گیرایەو پەروەردگار بەسێ چەشن نزاكەی بەجێ دەگەیەنێت: یاداواكەی دەسبەجێ بۆ دێنێتە دی ، یاخود لەقیامەتدا بۆی دەهێنێتە دی، یا بەئەندازەی ئەو دلوایە خراپەو نەهامەتی لێ دوور دەخاتەوە، یارانیش وتیان:

---

[٤٦] تەفسیری ئاسان: ٩٦.

[٤٧] تەفسیری ئاسان: ٢٨.

کەواتە نزاوپاڕانـەوە زیـاد بکـەین؟ پێغەمبـەری خـواش(ﷺ) فەرمووی: هەرچەند بپاڕێنەوە هێشتا هەر سۆزو میهری خوا پترو زیاترە))[٤٨].

## سەرەتـایەك بۆ نزاو پاڕانەوە دوای سوپاسگوزاری نواندن و سلاَواتدان لەدیاری پێغەمبەری ئازیز (ﷺ)

١ ــ (بریـــدە) ــ رەزای خـــوای لێبێـــت . دەفـــەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) گویٚ بیستی پیاوێك بوو دەپاڕایەوەو دەیـووت: پـەروەردگارا ؛ مـن داوات لێدەکـەم بـەوەی تـاك و تەنیایت و هیچ پەروەردگارێك نی یە لەتۆی تاك و تەنیا زیاترو لەکەس نەبوویت و کەسیشت لیٚنابێت و هاوتاشت نی یە لەم گەردوونەدا، پاشان پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرمووی: ((نـزاو پاڕانەوەت کرد لەپەروەردگار بەناوی مەزنی کەوا نزاو داوای پیٚ گیرادەبێت))[٤٩].

سـەبارەت بـەم فەرموودەیـەش (منـذري) دەڵێـت: (ابـو حســن)ی (مقدســی) مامۆســتامان دەڵێـت: (ســـند)ی ئـەم فەرموودەیە (طعن)نەکراوەو لەم مەسەلەیەشدا فەرموودەیـەك نەهاتووە (سند)ەکەی ئەوەندە باش بێت.

---

[٤٨] رواه أحمد.

[٤٩] رواه أبوداود والترمذي وحسنه.

٢ ـ (معـاذ)ی کـوڕی (جبـل) ـ ڕەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) گـوێی لێبـوو پیـاوێك نزاوپاڕانەوەی دەکردو دەیوت: ئـەی پـەروەردگاری خـاوەن ڕێـزو شـکۆمەندیی.. پێغەمبـەری خـواش(ﷺ) فـەرمووی: نزاکەت گیرایەو داوابکە لەپەروەردگار))[٥٠].

٣ ـ (معاویە) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: ((هەرکەس بەم پێنج وشـەیە نزاوپاڕانـەوە بکـات لـەبارەگای پـەروەردگار نزاکـەی گیراو بەجێیە: (لا الـه الا الله والله أکـبر ) پـەروەردگار تـاكو تەنیایەو هەر ئەویش مەزنو گەورەیە ، (لا الـه الا الله وحده لاشریك لـه لـه الملـك ولـه الحمد وهـو علی کـل شـئ قدیـر ) پـەروەردگار تـاكو تەنیایـەو هاوتـای نیـیـەو دەسـتەڵاتو ستایش هەر بۆئەوەو توانای هەموو شتێکی هەیە، ( لا الە الا الله ولا حـول ولا قـوة الا بـالله) پـەروەردگار تـاكو تەنیایـەو هەموو هێزو دەستەڵاتێکیش پەروەردگار خاوەنیەتی))[٥١].

---

[٥٠] رواه الترمذي وقال حسن.

[٥١] رواه الطبراني باسناد حسن.

# چەند نموونەیەك لەنزاو پاڕانەوە

- لەقورئانی پیرۆزدا:

١- ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ ﴿وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ [(البقرة: ١٢٧ـــ ١٢٨)]

((پەروەردگارا؛ ئەم كارەمان لێ وەربگرەو لەڕیزی چاكەكاندا تۆماری بكە چونكە بەڕاستی تۆ خوایەكی زۆر بیسەرو زانایت ، تەوبەو پەشیمانیمان لێ وەربگرە ، بێگومان تۆ خوایەكی زۆر تەوبە وەرگرو میهرەبان و دلۆڤانیت)).

٢ -﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾[(البقرة:٢٠١)].

واتە: ((پەروەردگارا ، لەدنیادا خێرو چاكەو نازو نیعمەتمان پێ ببەخشەو لەقیامەتیشدا لەنازو نیعمەتەكانی بەهەشت بەهرەمەندمان بكەو ، لەسزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە))[٥٢].

٣- ﴿ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾. [(البقرة: ٢٨٥)]

واتە: ((پەروەردگارا لیخۆشبوونی تۆمان دەوێت و سەرئەنجام هەر بۆلای تۆیە گەڕانەوە)).

---

[٥٢] تەفسیری ئاسان : ٣١.

٤ ـ﴿ رَبَّنَا لا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلا تُحَمِّلْنَا مَا لا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾[(البقرة:٢٨٦)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ لێمان مەگرە ئەگەر فەرامۆشیمان بەسەردا هات یان گوناهو هەڵەیەکمان لەدەست قەوما ، پەروەردگارا؛ ئەرکی سەختو کاری گران مەدە بەسەرماندا وەکو ئەوەی داوتە بەسەر ئەوانەی پێش ئێمەدا ، پەروەردگارا؛ ئەرکێك مەدە بەسەرماندا لەتواناماندا نەبێت ، تووشی بەڵاو ناخۆشیەکمان مەکە تواناو هێزو هەناومان لێ بېرێت ، گوناهانمان بسڕەوەو چاوپۆشی بکە لەهەڵەوتاوانەکانمانو دای پۆشە، داواکارین بەزەیت پیاماندا بێتەوەو ڕەحمان پێبکە ، هەر تۆ پشتو پەناو یاریدەدەری ئێمەیت ، جا بۆیە داوا دەکەین سەرمان بخەیت بەسەر قەومی کافرو خوانەناساندا))[٥٣].

٥ ـ ﴿رَبَّنَا لا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ﴾ [(آل عمران:٨)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ دوای ئەوەی کەهیدایەتو ڕێنموییت کردین، دڵەکانمان لامەدە لەرێگەی راستو

[٥٣] تەفسیری ئاسان: ٤٩.

لەڕەحمەتو بەخششی تایبەتی خۆت بەهرەوەرمان بکە چونکە بەڕاستی تۆ بەخشندەو بەخشێنەری))[٥٤].

٦ ـ ﴿ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ [(آل عمران:١٦)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ بەڕاستی ئێمە ئیمانو باوەڕمان هێناوە، وەلەگوناهەکانمان خۆش ببەو لەئاگری دۆزەخ بمانپارێزە))[٥٥].

٧ ـ ﴿رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنْزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾ [(آل عمران:٥٣)]

واتە: ((پەروەردگارا؛ ئێمە باوەڕمان هێناوە بەوەی داتبەزاندووەو ڕەوانەتکردووە، شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەشتین، دە تۆیش لەڕیزی شایەتەکانی گەیاندنی بەرنامەکەتدا تۆمارمان بکە))[٥٦].

٨ ـ ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ،رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ﴾ [(آل عمران: ١٩١ــ ١٩٢)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ تۆ ئەم هەموو دروستکراوانەت بێهودەو بێ ئامانج دروست نەکردووە ، پاکیی و بێگەردی

---

[٥٤] تەفسیری ئاسان: ٥٠.

[٥٥] تەفسیری ئاسان: ٥٢.

[٥٦] تەفسیری ئاسان: ٥٧.

شایستەی تۆیە، دەتۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزە ، پەروەردگارا! بەڕاستی تۆ هەرکەس بخەیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەوە ئیتر شەرمەزارو ریسواو خەجاڵەتت کردووەو بێگومان ستەمکارانیش هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نیە))[٥٧]

٩ـ ﴿رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِياً يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ﴾ [(آل عمران:١٩٣)].

واتە: ((پەروەردگارا! بەڕاستی ئێمە گوێمان لەبانگخوازێك بوو، بانگی کردین بۆ ئیمانو دەیفەرموو: ئیمان بهێنن بەپەروەردگارتان جا ئێمەش خێرا باوەڕمان هێناو وتمان: پەروەردگارا! دەتۆش لەگوناهو هەڵەکانمان خۆش بە ، چاوپۆشی بکە لەکردارە ناپەسەندەکانمانو لەسەر رێبازی چاکانو بەختەوەران بمانمرێنەو لەگەڵ ئەواندا کۆمان بکەرەوە))[٥٨]

١٠ـ ﴿رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ [(آل عمران:١٩٤)].

واتە: ((پەروەردگارا! ئەو بەڵێنانەشمان بۆ ئەنجام بدە کەلەسەر زاری پێغەمبەرانتدا بەئێمەت داوەو لەرۆژی

---

[٥٧] تەفسیری ئاسان: ٧٥.

[٥٨] تەفسیری ئاسان: ٧٥.

قیامەتیشدا خەجاڵەتو ڕووزەردمان مەکە، بێگومان تۆ بەڵێن شکێن نیتو بەڵێنی خۆت دەبەیتەسەر))[٥٩]

١١ ـ ﴿رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنْزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾ [(آل عمران:٥٣)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ ئێمە ئیمانو باوەڕمان هێناوە بەئاینی ئیسلام، دە تۆش لەڕیزی پەیڕەوانو شایەتەکاندا تۆمارمان بکە))[٦٠].

١٢ ـ ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[(الأعراف:٢٣)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ ئێمە ستەممان لەخۆمان کرد، خۆئەگەر لێمان خۆش نەبیتو بەزەیشت پێماندا نەیەتەوە، ئەوە بەڕاستی ئێمە سوێند بەخوا لەخەسارەتمەندو زەرەرمەندانین))[٦١]

١٣ ـ ﴿رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنْتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ﴾ [(الأعراف: ٨٩)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ خۆت دادوەری بکە لەسەر بنچینەی حەقو ڕاستی لەنێوان ئێمەو قەومو گەلماندا ، چونکە تۆ چاکترینی دادوەرانی))[٦٢].

---

[٥٩] تەفسیری ئاسان: ٧٥.

[٦٠] تەفسیری ئاسان: ١٢٢.

[٦١] تەفسیری ئاسان: ١٥٣.

[٦٢] تەفسیری ئاسان: ٦٢.

١٤. ﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْراً وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ [(البقرة: ٢٥٠)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ خۆگری‌و ئارامیمان بەسەردا بڕێژەو بەموسوڵمانێتی بمانمرێنە))[٦٣]

١٥ ـ ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ﴾ [(ابراهیم: ٤١)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ لەخۆم‌و دایك‌و باوكم‌و ئیمانداران خۆش ببە، لەو رۆژەدا كەلێپرسینەوە بەرپادەبێت))[٦٤]

١٦ـ ﴿ رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَداً﴾ [(الكهف: ١٠)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ لەلایەن خۆتەوە رەحمەت‌و میهرەبانی تایبەتیمان پێ ببەخشەو لەسۆزی خۆت بەهرەمەندمان بكەو رێگەی رزگاری‌و سەرفرازیمان بۆ بسازێنە لەم كارەماندا))[٦٥].

١٧ـ ﴿رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ﴾ [(المؤمنون: ١٠٩)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ ئێمە ئیمان‌و باوەڕی دامەزراومان بەزاتی تۆ هێناوە، دە لێمان خۆش ببەو رەحممان پێ بكە

---

[٦٣] تەفسیری ئاسان: ٤١.

[٦٤] تەفسیری ئاسان: ٢٦٠.

[٦٥] تەفسیری ئاسان: ٢٩٤.

چونکە تۆ چاکترین زاتێکی کەلەهەموو خاوەن رەحم و سۆزەکان میهرەبانتریت))[66]

١٨ ـ ﴿ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَاماً، إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرّاً وَمُقَاماً﴾ [(الفرقان:٦٥ـ٦٦)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ لەسزای ئاگری دۆزەخ بەدوورمان بکەو پەنامان بدە ، چونکە سزاو ئازاری لەکۆڵ نابێتەوەو بەردەوامە، بەڕاستی ئەو دۆزەخە شوێن و نیشتەجێیەکی زۆر ناخۆش و ناسازە))[67]

١٩ ـ ﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَاماً﴾ [(الفرقان:٧٤)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ لەهاوسەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کەببنە مایەی ڕووناکی دیدەمان و شادمانی دڵمان و بمان کە بەپێشەوا بۆ پارێزکاران و خواناسان))[68].

٢٠ ـ ﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَحْمَةً وَعِلْماً فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ، رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدْتَهُمْ وَمَنْ صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ [(غافر:٧ـ٨)].

---

[66] تەفسیری ئاسان: ٣٤٩.

[67] تەفسیری ئاسان: ٣٦٥.

[68] تەفسیری ئاسان: ٣٦٦.

واتە: ((پەروەردگارا؛ رەحمو میهرەبانی تۆ، زانستو زانیاری تۆ ، هەموو شتێکت پێ گرتۆتەوە، کەوابوو خۆش ببە لەوانەی کەتەوبەیان کردووەو لەگوناهەکانیان پەشیمانن‌وشوێن بەرنامەو رێبازی تۆ دەکەون ، هەروەها لەئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە ، پەروەردگارا؛ بیانخەرە ئەو باخو باخاتەی بەهەشتی عەدنەوە کەبەڵێنت پێداون، هاورێ لەگەڵ ئەو کەسانەدا کەچاكو خواناسن، لەباوكو دایكو هاوسەرانو نەوەکانیان ، بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی بالادەستو دانایت))[69].

٢١. ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [(الحشر: ١٠)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ لەئێمەو لەو برایانەشمان خۆش ببە کەپێش ئێمە رێبازی ئیمانیان گرتەبەرو لەدڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغزو کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە لەئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەدگارا؛ تۆ بەڕاستی بەسۆزو بەخشندەو میهرەبانیت))[70].

٢٢. ﴿رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ [(الممتحنة: ٤)].

---

[69] تەفسیری ئاسان: ٤٦٧ . ٤٦٨.

[70] تەفسیری ئاسان: ٥٤٧.

واتە: ((پەروەردگارا؛ هەر پشتمان بەتۆ بەستووە هەر بۆلای تۆش گەڕاوینەتەوە ، سەرەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە))[٧١]

٢٣ ـ ﴿رَبَّنَا لا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ [(الممتحنة:٥)].

واتە: ((پەروەردگارا مەمانگێڕە بەمایەی گومڕایی بۆ ئەوانەی بێباوەڕ بوون، لێشمان خۆش ببە پەروەردگارمان بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی بالادەستو دانایت))[٧٢].

٢٤. ﴿رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ [(التحريم: ٨)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ ئەم نوورو رووناکیەمان بۆ زیاد بکەو لێمان خۆش ببە، چونکە بەڕاستی تۆ دەسەلاتت بەسەر هەموو شتێکدا هەیە))[٧٣].

٢٥ ـ ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ [(آل عمران: ٣٨)]

واتە: ((پەروەردگارا؛ نەوەی چاکو پاکم پێ ببەخشە ، بەڕاستی تۆ بیسەری دوعاو نزایت))[٧٤].

---

[٧١] تەفسیری ئاسان: ٥٤٩.

[٧٢] تەفسیری ئاسان: ٥٤٩.

[٧٣] تەفسیری ئاسان: ٥٦١.

٢٦ ـ ﴿رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنْتَ وَلِيِّي فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ [(يوسف:١٠١)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ بەڕاستی تۆ پایەت پیٚبەخشیم‌و لەلیٚکدانەوەی خەو شارەزات کردم، ئەی بەدیهیٚنەری ئاسمانەکان‌و زەوی ، تۆ پشت‌و پەنا‌و یارویاوەری منیت لەدنیاو قیامەتدا داواکارم کەبەموسوڵمانی بم مریٚنیت‌و بمخەیتە ریزی پاکانەوەو بمگەیەنیت بەکاروانی چاکان))[٧٥].

٢٧ـ ﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ﴾ [(ابراهيم: ٤٠)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ خۆم‌و نەوەکانم بگیٚڕە لەو کەسانەی کەئەنجامدەری نویٚژ بین بەچاکی ، پەروەردگارا؛ دوعاو نزام گیرابکە))[٧٦].

٢٨ـ ﴿رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَاناً نَصِيراً﴾[(الاسراء: ٨٠)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ یارمەتیم بدە تا هەرکاتیٚك دەستبەکاری هەرخیٚریٚك بووم بەچاکی‌و بەڕاستی‌و دروستی

---

[٧٤] تەفسیری ئاسان: ٥٥.
[٧٥] تەفسیری ئاسان: ٢٤٧.
[٧٦] تەفسیری ئاسان: ٢٦٠.

ئــەنجامی بــدەمو لەهــەر کــارێك بوومــەوەو ئــەنجامەمدا ســەرەنجامێکی چــاکی هــەبێتو بــەجوانی لێــی دەرچــمو هەمیشەو بەردەوام لەلایەن خۆتەوە دەسەلأتێکم پێ ببەخشە کەببێتە هۆی سەرکەوتنی بەردەوامم))[77].

٢٩ ـ ﴿رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي، وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي، وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسَانِي، يَفْقَهُوا قَوْلِي﴾[(طــه:٢٥ــ٢٨)].

واتــە: ((پــەروەردگارا؛ ســینەو دڵو دەروونم ئاســوودەو گوشاد بکە، ئیشوکارو هــەوڵو کۆششــم بــۆ ئاســان بکــە، گرێیی زمانم بکەرەوەو زمانم گۆیا و پاراو بکە، تا لەقسەو گوفتارو مەرامم تێبگەن))[78].

٣٠. ﴿رَبِّ زِدْنِي عِلْماً﴾[(طــه: ١١٤)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ بەردەوام زانستو زانیاری زۆرترو زیاترم پێ ببەخشە))[79].

٣١. ﴿رَبِّ أَنْزِلْنِــي مُــنْزَلاً مُبَارَكــاً وَأَنْــتَ خَــيْرُ الْمُنْزِلِينَ﴾[(المؤمنون:٢٩)].

واتــە: ((پــەروەردگارا؛ لەشــوێنێکی موبــارەكو پــیرۆز دامبەزێنە، چونکە تۆ چاکترین زاتێکی بۆئەوەی لەشوێنی موبارەكو پیرۆزدا دامانبەزێنیت))[80].

---

[77] تەفسیری ئاسان: ٢٩٠.

[78] تەفسیری ئاسان: ٣١٣.

[79] تەفسیری ئاسان: ٣٢٠.

٣٢ـ ﴿رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ، وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ﴾ [(المؤمنون:٩٧ــ٩٨)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ من پەنا دەگرم بەتۆ لەهەموو خەتەرەو خەیاڵو وەسوەسەی شەیتانەکان ، پەروەردگارا؛ من پەنادەگرم بەتۆ ئەی پەروەردگارم کەشەیتانەکان بەدەورمدا کۆببنەوەو سەرم لێ بشێوێنن))[٨١].

٣٣ـ ﴿رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ﴾[(المؤمنون:١١٨)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ لەگوناهو هەڵەکانم خۆش ببەو رەحمم پێبکە چونکە تۆ لەهەموو میهرەبانان میرەبانتریت))[٨٢].

٣٤ـ ﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ، وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ،... وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ﴾. [(الشعراء:٨٣ــ٨٧)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ زانیاریو دانایىو دەسەڵاتی تەواوم پێببەخشەو پەیوەستم بکە بەچاکەکارانەوە، پەروەردگارا؛ یادی خێرم با لەسەر زاری نەوەکانی داهاتوو بمێنێت ، بمگێڕە لەو کەسانەش کەبەهەشتی پڕ لەنازو نیعمەت

---

[٨٠] تەفسیری ئاسان: ٣٤٤.

[٨١] تەفسیری ئاسان: ٣٤٨.

[٨٢] تەفسیری ئاسان: ٣٤٩.

بەدەسـت دەهێنـن و دەبنـە خـاوەنی، ..لـەرۆژی زیندووبوونەوەی ئەو خەڵکەدا خەجاڵەتم مەکە))[٨٣].

٣٥. ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾ [(النمل: ١٩)].

واتـە: ((پـەروەردگارا؛ یارمـەتیم بـدە دڵ و دەروون و رۆح و گیـانم کۆبکـەرەوە، تاسوپاسـگوزاری نـازو نیعمەتـەکانت بم کەبەسەر من و دایك و باوکمدا رژاندووتـە، هـەروەها کۆمـەکیم بکە تـا کـاروکردەوەی چاکە ئەنجام بـدەم کـەتۆ پێـی رازیـی بیـت و بەڕەحمـەت و میـهرەبانی خـۆت بمخـەرە ریـزی بـەندە چاکەکانتەوە))[٨٤].

٣٦. ﴿رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ [(القصص: ١٦)].

واتـە: ((پـەروەردگارا؛ من بەڕاستی ستەمم لەخۆم کرد لێم ببـورە و بمبەخشـە، جـاخوای میهرەبانیش لێـی خۆشـبوو، بێگومان ئەو زاتێکی لێخۆشبوو میهرەبانە))[٨٥].

٣٧. ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنْزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾ [(القصص: ٢٤)].

---

[٨٣] تەفسیری ئاسان: ٣٧١،٣٧٠.

[٨٤] تەفسیری ئاسان: ٣٧٨.

[٨٥] تەفسیری ئاسان: ٣٨٧.

واتە: ((پەروەردگارا؛ بەڕاستی تۆ خێرو بێری زۆرت بەسەردا ڕژاندووم، بەڵام هێشتا هەژارمو ئاتاجی بەخششی زیاترم))[٨٦].

٣٨- ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ [(الصافات: ١٠٠)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ نەوەیەکی چاكو پاكم پێببەخشە))[٨٧].

٣٩. ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾[(الاحقاف: ١٥)].

واتە: ((پەروەردگارا؛ كۆمەكیم بكەو یارمەتیم بدە تا شوكرانە بژێرو سوپاسگوزاری ئەو نازو نیعمەتانە بم كەبە منو دایكو باوكمت بەخشیووە، هەروەها یارمەتیم بدە لەو جۆرە كاروكردەوە چاكانە ئەنجام بدەم، كە تۆ پێی ڕازیت، داواكاریشم چاكە بڕوێنیت لەناو نەوەكانمدا لەبەر قازانجی خۆم بەڕاستی من گەڕاومەتەوە بۆلای تۆ ، تا لە گوناهەكانم خۆش ببیتو من لەموسوڵمانانی گوێڕایەڵو فەرمانبەردارم))[٨٨].

---

[٨٦] تەفسیری ئاسان: ٢٨٨.

[٨٧] تەفسیری ئاسان: ٤٤٩.

[٨٨] تەفسیری ئاسان: ٥٠٤.

٤٠ـ ﴿رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَنْ دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِناً وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَاراً﴾ [(نوح:٢٨)].

واتە : ((پەروەردگارا؛ لەخۆم و دایك و باوكم و ئەوانە خۆش ببە كەدێنە ماڵم ؛ بەئیمان و باوەڕەوە ، هەروەها لەئیماندارانی پیاوو ئیماندارانی ئافرەتیش خۆش ببە، ستەمكارانیش تەنها تیاچوون نەبێت هیچی تر نەكەیتە بەشیان))[٨٩].

## چەپكێك لەگوڵزاری نزاو دوعاكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

١ ـ عَنْ انس (ﷺ)قَالَ : كَانَ اكْثَرُ دُعَاء النَّبي(ﷺ) : ((اللهُمَّ اتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّار﴾[٩٠].

واتە: (انس) ـ رەزای خوای لێبێت . لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ، دەفەرموێت: ((پەروەردگارا؛ خێرو چاكەمان پێ ببەخشە لەدنیاو قیامەتداو لەئاگری دۆزەخ بەدوورمان بگرە)).

---

[٨٩] تەفسیری ئاسان: ٥٧١.

[٩٠] متفق عليه.

٢ ــ وَعَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) أنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ: ((اللهُمَّ اِني أسْألُكَ الهُدَى وَالتُّقَى وَالعَفَافَ وَالغِنَى))[٩١].

واتە: (ابن مسعود) ـ رەزای خوای لێبێت . لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: (( پەروەردگارا؛ خوازیاری رێنموونیو خواناسیو پاکیزەییو دەوڵەمەندیم لێت)).

٣ ـ وَعَنْ أبِي هُرَيرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولِ اللهِ(ﷺ) يَقُولُ: ((اللهُمَّ أصْلِحْ لِي دِينِي الذي هُوَ عِصْمَةُ أمْرِي وَصْلِحْ لِي اخِرَتِي التَّي فِيهَا مَعَادِي ، وَاجْعَلِ الحَيَاةَ زِيَادةً لِي فِي كُلِ خَيرٍ وَاجْعَلِ المَوتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِ شَرٍ))[٩٢].

واتە: (ابی هریرە) ـ رەزای خوای لێبێت . لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((پەروەردگارا؛ دینم بۆ فەراهەمو چاك بكە كەوا سەراپای هەموو كاروبارەكانمەو، دنیاشم بۆ فەراهەمو چاك بكە كەوا بژێوی ژیانمی تێدایە، دەرەنجامی قیامەتیشم بۆ بەدەست بهێنە كەوادەی دیاریكراوی رێكەمەو ، ژینم بكە بەسایەو مایەی كرداری چاكەو بامردنیشم سەرفرازیم بێت لەگشت رەفتارو كردارێكی خراپو نالەبار)).

---

[٩١] رواه مُسلم.

[٩٢] رواه مسلم.

٤ ـ وَعَنْ عَلْيٍ(ﷺ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((قُلْ اللهُمَّ اهْدِني وَسَدِدْني)) وَفِي رِوَايَةٍ : ((اللهُمَّ انِي أسْألُكَ الهُدَى وَالسَدَادَ))[٩٣].

واتە: (علی) ــ ڕەزای خـوای لێبێت . دەفـەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فیێری کـردم بڵێم: ((پـەروەردگارا ؛ ڕێنموییو دامەزراویم پیٚ ببەخشە)) لە(ڕوایە)تێکی دیکەشدا فەرمووی: ((پەروەردگارا؛ لەکارەکانمدا ڕێنموییو پێکاندنم پیٚ ببەخشە)).

٥ ـ وَعَنْ عَائشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا): انَّ النَّبيَّ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ فِي دُعَائه : ((اللهُمَّ انِّي أعوُذُبِكَ مِنْ شَرِ مَا عَمِلتُ وَمِنْ شَرِ مَا لم اعْمَلْ))[٩٤].

واتە: (عائشە) ـ ڕەزای خـوای لێبێت ــ دەفـەرموێت: پێغەمبەری خـوا(ﷺ) لـەنزاو پاڕانـەوەکانیدا دەیفـەرموو: ((پـەروەردگارا؛ پـەنادەگرم بـەتۆ لەشـەڕو خراپـەی ڕەفتاری پێشوو و داهاتووم)).

٦ ـ وَعَنْ ابِي بَكرِ الصديقِ (ﷺ) انَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ): عَلِمْني دُعاءًأدْعو بِهِ في صَلَاتي ، قَالَ: ((قُلِ اللهُمَّ أني ظَلَمْتُ نَفْسي ظُلمًا كَثِيراً ، وَلاَ يَغْفرُ الذُنُوبَ الا انْتَ ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْني انَّكَ انْتَ الغَفُورُ الرَّحيم))[٩٥].

---

[٩٣] رواه مسلم.

[٩٤] رواه مسلم.

[٩٥] متفق عليه.

واتە: (ابی بکر)ی (صدیق) - ڕەزای خوای لێبێت . داوای لەپێغەمبەری خوا کرد(ﷺ) نزایەکی فێر بکات هەتا لەنوێژەکانیدا بیکات، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: بڵێ: ((پەروەردگارا؛ من ستەمێکی یەکجار گەورەم دەرهەق بەنەفسی خۆم کردووەو کەسیش نی‌یە لێخۆشبووی تاوان‌و گوناه تۆ نەبێت، داوات لێدەکەم بەسۆزو میهری خۆت بمبوریت‌و هەرتۆ لێبوردەو بەسۆزیت)).

٧ - وَعَنْ ابِي مُوسَى (ﷺ) عَن النَّبي (ﷺ) انَّهُ كَانَ يَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاء: ((اللهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي وَاسْرَافِي فِي أمْرِي ، وَمَا انْتَ اعْلَمُ بِه مِنّي : اللهُمَّ اغْفِرْلِي جِدي وَهَزْلِي وَخَطَئِي وَعَمَدِي وَكُل ذَلكَ عِنْدِي . اللهُمَّ اغْفِرْ لي مَا قَدَمْتُ وَما اخَرْتُ وَمَا اسْرَرت وَمَا اعْلَنْتُ وَمَا انْتَ اعْلَمُ منّي ، انْتَ المُقَدِمُ ، وَانْتَ المُؤَخرُ ، وَانْتَ عَلَى كُل شَئٍ قَدير))[٩٦]

واتە: (ابی موسی) - ڕەزای خوای لێبێت . دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەم نزایە دەپاڕایەوە لەپەروەردگار: ((پەروەردگارا؛ لەگوناهو هەڵەو نەزانین‌و زیادەڕەوی لەڕەفتارەکانم‌و ئەوەشی تۆ لەبارەی منەوە دەیزانی خۆش‌و ببورە، پەروەردگارا؛ لەهەڵەو گاڵتەو ڕەفتاری ئەنقەست ئاساو پشت ئەستورم ببورەو ئۆباڵی هەمووی لەئەستۆی

---

[٩٦] متفق عليه.

خۆمدایـه، پـەروەردگارا ؛ لـەرەفتاروکردارەکانی پێشـوو و داهاتوو دیارو نهێنیو ئەوەی خۆت دەیزانـی لەسـەرم خۆش ببەو، پێشـینەو کۆتـایی هـەموو کاروبارێك هـەر بەدەسـتی تۆیەو بالأدەستو زاڵی بەسەر هەموو ڕووداوێکدا)).

٨ ـ وعَـنْ زَيـد بـنْ أرْقـمْ (ﷺ) قـال: كَـانَ رَسُـول الله (ﷺ) يَقُولُ: ((اللهُمَّ إنِّي أعُوذُبِكَ مِنَ العَجْزِ وَالكَسَلِ وَالبُخْلِ وَالهَرَمِ وَعَذَابِ القَبْرِ. اللهُمَّ ات نَفْسِي تَقْوَاهَا وزَكِها أنـتَ خَـيْرُ مَـنْ زَكَّاهَا ، أنْتَ وَلِيُّهَا وَمَولاَهَا ، اللهُمَّ إنِّي أعُوذُبِكَ مِنْ عِلْمٍ لاَيَنْفَعُ، وَمِـنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَـعُ ، وَمِـنْ نَفْـسٍ لاَ تَشْـبَعُ ، وَمِنْ دَعْـوَةٍ لاَ يُسْتَجَابُ لَهَا))[٩٧].

واتـه: (زيـد)ی کـوڕی (أرقـم) ـ ڕەزای خـوای لێبێـت . دەفـەرموێت: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لـەنزاکانیدا دەیفـەرموو: ((پـــەروەردگارا؛ پـــەنادەگرم بـــەتۆ لەبێدەســـتەڵاتیو دەستەپاچەییو تەمبەڵیو ئیرەییو پیریو سزای نێوگۆڕ. پـەروەردگارا؛ دەروونم بـەپارێزگاریو خواناسـی شـادبکەو بێگـەردو پـاکی بکـەرەوە چونکـە بەتـەنیا تۆیـت پـاكو پوختکاری دەروونو هاودەمو گەورەو سەردار، پەروەردگارا؛ پـەنادەگرم بـەتۆ لـەزانیاری بێسـوودو دڵـی سـەرپێچکارو نەفسی برسیو نزاو پاڕانەوەیەك گیراو قبوڵ نەبێت)).

[٩٧] رواه مُسلم.

٩ ـ وَعَنْ ابن عُمَرِ (رضي الله عنه) قالَ: كَانَ مِنْ دُعَاء رَسُولِ الله (ﷺ): ((اللهُمَّ انّي أعُوذُبِك مِنْ زَوالِ نِعْمَتِكَ وَتَحَولِ عَافيَتِكِ، وَفُجاءَةِ نِقْمَتِك، وَجَمْيعِ سَخَطِك))[٩٨].

واتە: (ابن عمر) ـ رەزای خوایان لێبێت ـ دەفەرموێت: لەنزاو پاڕانەوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ((پەروەردگارا ؛ پەنادەگرم بەتۆ لەئاوابوونی نازو نیعمەتو ڕەوینەوەی لەش ساغیو بێوەیت بۆمو، پەنات پێدەگرم لەبەلاو دەردەسەری کتوپڕو ڕژانی جامی خەشمو قینت بەسەرما)).

١٠ ـ وَعَنْ عَلّيٍّ (رضي الله عنه) انَّ مُكَاتباً جاءهُ فَقَال: انّي عَجَزتُ عَنْ كتَابَتي فأعني ؛ قَالَ الا أعَلمُك كَلمَاتٍ عَلَمَنيُهُنَّ رَسُولُ الله (ﷺ) ، لَو كَانَ عَلَيْكَ مثلُ جَبَلٍ ـ دَيْنَا أداهُ اللهُ عَنْك؟ قُل: ((اللهُمَّ اكفِنّي بِحَلالِكَ عَنْ حَرَامِكَ ، وَاغْنيني بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ))[٩٩].

واتە: (علی) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پیاوێکی قەرزار هات بۆلاو وتی: قەرزارمو ناتوانم قەرزەکانم بدەمەوە؛ داوات لێدەکەم دەستگیرۆیم بکەی ، منیش پێم وت: باچەند وشەیەکت فێر بکەم کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ)

[٩٨] رواه مسلم.

[٩٩] رواه الترمذي وقال حديث حسن.

فێری کردووم‌و ئەوەندە کاریگەرە گەر بەئەندازەی کێوێک قەرزت لابێت پەروەردگار کۆمەک‌و یارمەتیت دەدات لەدانەوەیدا بڵێ: ((پەروەردگارا؛ ئەوەندە رزق‌و رۆزی حەڵاڵ‌و دروستم پێ ببەخشە هەرگیز بەرنەکەم بەلای حەرام‌و نادروستداو، بەرێزو خێرۆمەندی خۆت دەوڵەمەندو بێ‌باکم بکە لەخەڵکی)).

١١- وَعَنْ شَهْر بنْ حَوْشَب قَالَ: قُلتُ لأم سَلَمَة (رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا) يا أُمَّ المؤمنِين مَا كانَ أكثرُ دُعاء رَسُولِ الله (ﷺ) اذا كَانَ عِنْدَك؟ قَالَتْ: كَانَ أكثرُ دُعَاءه: ((يَا مُقَلبَ القُلُوب ثَبِتْ قَلبِي عَلَى دِينِك))[100].

واتە: (شەهر)ی کوڕی (حوشب) دەفەرموێت: لە (ام سلمه)م پرسی: ئەی دایکی موسوڵمانان دەمەوێت بزانم کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەماڵەکەی تۆدا بوایە کام نزاوپاڕانەوەی پتر دەکرد؟ ئەویش فەرمووی: ئەو نزاو پاڕانەوەیەی بەزۆری دەیکرد بریتی‌بوو لە: ((ئەی هەڵسووڕێنەری دڵان دڵم جێگیرو چەسپاو بکە لەسەر ئاینەکەت)).

١٢- عَنْ أبيِّ الدَرْدَاء (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): كَانَ مِنْ دُعَاءِ دَاود (عليه السلام): ((اللهُمَّ انِّي اسألُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يُحِبُك

[100] رواه الترمذي وقال حديث حسن.

وَالعَمَلَ الذي يُبَلِّغُني حُبَّكَ، اللهُمَّ اجعَل حُبَّكَ أحَبَّ اليَّ مِنْ نَفسي وَ اهْلي وَمِنَ الماءِ البَارِد))[101].

واتە: (أبي درداء) . ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: یەکێك لەنزاو پاڕانەوەکانی (داود) پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) ئەوەبوو دەیفەرموو: (( پەروەردگارا؛ من خوازیاری ئەوین و خۆشەویستی تۆو ئەو بەندە چاکانەم کەوا تۆیان خۆش دەوێت لەگەڵ ئەو ڕەفتارانەی دەمگەیەنێت بەخۆشەویستی تۆ، پەروەردگارا ؛ خۆشەویستی خۆت لەدڵما بالآدەست بکە لەخۆم و ماڵ و منداڵ و ئاوی فێنك و سازگار)).

١٣ ـ وَعَنْ ابنِ مَسْعودٍ (ﷺ) قَالَ كَانَ مِنْ دُعاء رَسُولِ الله (ﷺ) : ((اللهُمَّ انِيِّ أسألُكَ مُوجِبَاتِ رَحْمَتِكَ وَعَزائِمُ مَغْفِرَتِكَ ، وَالسَلاَمَةُ مِنْ كُلِ اثمٍ ، وَالغَنيمَةُ مِنْ كُلِ بِرٍ وَالفَوزَ بِالْجَنَّةِ ، وَالنَجاةَ مِنَ النَّارِ))[102].

واتە: (ابن مسعود) ـ ڕەزای خوای لێبێت . دەفەرموێت: لەنزاکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەبوو دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ خوازیاری ئەو بارو حاڵانەم دەبێتە مایەی سۆزو بەزەیی و هەڵقوڵانی سەرچاوەی لێبوردەیت ،

---

[101] رواه الترمذي وقال حديث حسن.

[102] رواه الحاكم وقال: حديث صحيح على شرط مسلم.

پــەروەردگارا؛ خوازيــارم دووره پــەريزم بكــەيت لــەتاوان‌و گوناهو، خێراندارم بكەيت لەسەراپای چاكەو، بەبەهەشــت چاوم گەش بكـەيت‌و لـەئاگری دۆزەخيـش بـەدوورو تـەريكم بكەيت)).

١٤ ـ عَنْ عَائِشَـةَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـها) أنَّ النَّـبيَّ قَـالَ لَـها: ((قُولِي: اللهُمَّ إني أسْألُكَ مِنَ الخَيْرِ كُلّه عَاجِله وَاجِلِه مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أعْلَم وَأعُوذُبِكَ مِنَ الشَرِ كُلْه عَاجِلِه وَاجِلِه مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أعلَم وَاسْألُكَ الجَنَّةَ وَمَا قَرَّبَ اِلَيهَا مِنْ قَولٍ أوْ عَمَلٍ. وَاعُوذُبِكَ مِنَ النَّارِ وَمَا قَرَّبَ اِلَيْهَا مِنْ قَولٍ أو عَمَلٍ وَاسْألُكَ خير مَا سألَكَ بِهِ عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ مُحَمَدٍ(ﷺ) وَاعُوذُبِكَ مِنْ شَرِ مَا اسْتَعَاذَكَ مِنْهُ عَبْدُكَ وَرَسُولُك مُحَمَدٍ (ﷺ) وَاسْألُكَ مَا قَضَيتَ لِي مِنْ أمْرٍ أنْ تَجْعَلَ عَاقِبَتَهُ رُشْداً))[١٠٣].

واتـه: (عائشـه) ـ رەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێـی فەرمووم (عائشــه )نزابكـەو بڵـێ: ((پـەروەردگارا؛ من خوازيـاری خـێرم لەئێسـتاو داهـاتوودا ئەوەی دەيزانم‌و ئەوەشی بێ‌ئاگام لێی ، پەناش دەگرم بەتۆ لەشەڕو خراپەی ئێستاو داهاتوو و ئەوەی دەيزانم‌و ئەوەشی بێ‌ئاگــام لێــی ، پــەروەردگارا؛ خوازيــاری بەهەشــت‌و هۆكارەكـانی نزيكبوونـەوەم لێـی لەوتـەوو رەفتـار، پـەناش

[١٠٣] مسند الامام أحمد وسنن ابن ماجه.

دەگرم بەتۆ لەئاگری دۆزەخ و ئەو هۆكارانەی بەكێشم دەكەن بــۆی لەوتــەو رەفتــارو هــەر جموجولّێــك ، خوایــە گیــان خوازیــاری نــزاو داواكــانی پێغەمبــەری خــوام و(ﷺ) پــەناش دەگــرم لــەو رەفتارانــەی ئــەو پــەنای پێگرتوویــت لێیــان ، پەروەردگارا ؛ خوازیارم هــەر قــەزاو چارەنووســێكت هێنایــە رێم دەرەنجامەكەی بەرێنومایی كۆتایی بێت)).

١٥ ـ رَوَى التِرْمِذيُّ أنَّ النَّبي(ﷺ) قَالَ: ((اللهُمَّ انْفَعْني بِمَا عَلَمْتَنِي ، وَعَلِمْنِي مَا يَنْفَعُنِي ، وَزِدْنِي عِلْماً ، وَالحَمْدُ لله عَلَى كل حَالٍ ، وَأعُوذُ بِالله مِنَ حَالِ أهْلِ النَّارِ)).

واتــە: (ترمــذي) دەگێڕێتــەوە ؛ پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) فەرموویەتی: (( پەروەردگارا؛ سوودمەندم بكە بەو زانستەی فێرت كردوم و زانیاری بەسوودم فێربكە، سینەشم والآبكە بۆ وەرگرتنــی زانیاری و سوپاســگوزارم لەســەر گشــت حــاڵ و بارێك و، پەنا دەگرم پێت لەحاڵ و باری دۆزەخیەكان)).

١٦ . وَعَنْ أبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَقُولُ: ((اللهُمَّ انِّي أعوذُبِكَ مِنَ الجُوعِ فَأنَّهُ بِئْسَ الضَجِيعُ . وأعوذُبِكَ مِنَ الخِيَانَةِ فأنَّها بِئْسَتِ البِطَانَةُ))[١٠٤].

واتە: (ابی هریرە) ـ رەزای خوای لێبێــت . دەفــەرموێت: هەمیشــە پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) دەیفــەرموو: ((پــەروەردگارا؛

---

[١٠٤] رواه البخاري.

پەنادەگرم بەتۆ لەبرسێتی کەوا بەدترین حاڵو بارەو ، پەنا دەگرم بەتۆ لەناپاکی کەوا خراپترین ڕەوشو ڕەوگەیە)).

١٧ ـ وَعَنْ ابنِ عَبَاس (ﷺ) أنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ يَقُولَ: ((اللهُمَّ لَكَ أسْلَمْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَلْتُ وَاليْكَ أنَبْتُ وَبِكَ خَاصَمْتُ ، اللهُمَّ انِّي أعُوذُبِكَ بِعِزَّتِكَ لاَ الَهَ الاَ أنْتَ أنْ تَضِلَنِي، انْتَ الحَيُّ الذي لاَيَمُوتُ وَالجِنُ وَالأنْسُ يَمُوتُونَ))[١٠٥].

واتە: (ابن عباس) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: پەروەردگارا! خۆم بەتۆ سپاردووەو باوەڕم پێهێناویتو لەڕەفتارەکانمدا پشتم پێبەستوویتو بۆلای تۆ هانام هێناوەو، لەبەربەرەکانیشدا بەپەناو پشتگیرم داناوی ، خوایە گیان پەنادەگرم بەمەزنیو شکۆمەندی تۆو گەواهی تاکو تەنیایت دەدەمو وێڵو سەرگەردانم مەکە ، تۆی زیندووی نەمرو سەراپای پەریو مەردوم دەمرن)).

١٨ ـ وَعَنْ عِمْرَان بن الحُصَيْن (ﷺ) : أنَّ النَّبِي(ﷺ) عَلَمَ أبَا حَصَيناً كَلِمَتَيْنِ يَدْعُوبِهِمَا: ((اللهُمَّ ألهِمْنِي رُشْدِي وَأعِذْنِي مِنَ شَرِ نَفْسِي))[١٠٦].

واتە: (عمران)ی کوڕی (حصین) ـ ڕەزای خوایان لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە: دەفەرموێت:

---

[١٠٥] رواه البخاري ومسلم.

[١٠٦] رواه الترمذي وقال: حديث حسن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) (ابا حصین)ی فێری دوو وشە کرد هەتا نزاوپاڕانەوەیان پێ بکات‌و پێی فەرموو بڵێ: ((پەروەردگارا؛ ڕێنموویی بخە بەرمو، لەشەڕو خراپەی نەفس بمپارێزە)).

١٩ ـ وَعَنْ أنسٍ (ﷺ) أنَّ النَّبيَّ (ﷺ) كانَ يَقُول: ((اللهُمَّ اني أعُوذُبِكَ مِنَ البَرَصِ ، وَالجنُونِ وَالجذَامِ وَسيئِ الأسْقَام))[١٠٧].

واتە: (انس) ـ ڕەزای خوای لێبێت. دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ پەنام بدە لەبەڵەکی‌و شێتی‌و گەڕی‌و دەردی سەخت‌و گران)).

# پەندو سوود

١)(عائشە) ـ ڕەزای خوای لێبێت. لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((وریایی نابێتە بەربەست لەدابەزینی قەدەر ، بەلاّم نزاوپاڕانەوە دەبێتە بەربەست‌و سوودێك بۆ ئەو قەزایەی هاتووەو ئەوەشی نەهاتووە، زۆرجاریش نەهامەتی دێتە خوارەوەو لەگەڵ نزاو پاڕانەوەدا ڕووبەڕوو دەبن‌و فشار دەخەنە سەر یەکدی تا ڕۆژی قیامەت))[١٠٨].

٢ ـ (سلمان) ی (فارسی) ـ ڕەزای خوای لێبێت. لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت:

---

[١٠٧] رواه أبوداود باسناد صحيح.

[١٠٨] رواه البزار والطبراني والحاكم وقال صحيح الاسناد.

((بەربەستو رێگر نىيە بۆ چارەنووسو قەزا جگە لەنزاو پاڕانەوە نەبێتو، هۆی تەمەن درێژیش بەتەنیا رەفتاری چاکەیە))[109]

٣ ـ هەروەها (سلمان) ی (فارسی) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: ((بەلاو نەهامەتی بەنزاو پاڕانەوە دەدرێتە دواوە، نزاوپاڕانەوە هۆکارێکە بۆ رێگرتن لەبەلاو نەهامەتیو هێنانە کایەی سۆزو میهری خوایی هەروەك چۆن قەڵغان هۆکارێکە لەئاناى شیرو شمشێرو ئاوایش بۆ رووانندنی رووەكو بەروبووم هۆکاری سەرەکیە، لەڕاستیدا هەرکات نزاو پاڕانەوە لەگەڵ بەلاو نەهامەتی رووبەڕوو دەبنەوە و هەریەك فشار دەخەنە سەریەك بەچەشنی قەڵغانو شمشێر خۆیان لەیەك هەڵدەسوون،بۆ نموونە هەرگیز لەمەرجەکانی داننان بەچارەو قەزای خوایی‌دا نی‌یە مرۆڤ چەك هەڵنەگرێت بۆ دوورخستنەوەی زیان چونکە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلْيَأْخُذُوا حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ﴾[(النساء:١٠٢)]. واتە:((باهۆشیارو چەکداریش بن))[110]، بۆیە دەبینین پەروەردگار رووداوەکان ریزبەند دەکاتو هۆکارەکانیشی بۆ دادەنێت.

---

(109) رواه الترمذي وقال حديث حسن غريب.

(110) تەفسیری ئاسان: ٩٥.

## بەشی سێیەم

لەنزاو پاڕانەوەکانی شەوو ڕۆژ

یادوزیکری لەخەوهەستان.

یادوزیکری چوونە سەرئاو ( دەست بەئاو گەیاندن )

نزای دەستنوێژ.

دوعای چوون بۆ مزگەوت

دوعای نا نخواردن

دوعای بەرگ پۆشین و بەرئاوێنە

دوعاکانی نێومالْ

دوعاکانی کۆتایی کۆڕو دانیشتن

دوعاکانی نووستن

## یادو زیکری لەخەو هەستان

١ـ قَالَ حُذَيْفَةَ (ﷺ) : كَانَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) اذا اسْتَيْقَظَ مِنْ مَنَامِه قَالَ: ((الحَمْدُ لِلهِ الذي احْيَانَا بَعْدَمَا امَاتَنَا وَالَيْهِ النُّشُور))[1].

واتە: (حذیفە) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەرکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەخەو بەئاگا بهاتایە دەیفەرموو: ((سوپاس و ستایش بۆئەو پەروەردگارەی زیندووی کردینەوەو بەئاگای هێناین پاش مردن و لەهۆش خۆ چوونمان، بەڕاستی هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە)).

٢ ـ عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنْ النَّبي (ﷺ) قَالَ: ((اذا اسْتَيْقَظَ أحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ : الحَمْدُ لله الذي ردَّ علَيَّ رُوحِي وَعَافَانِي فِي جَسَدِي ، وَأذِنَ لِي بِذِكْرِه))[2].

واتە: (ابی هريره) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((ئەگەر لەنووستن بەئاگاو بێداربوون بڵێن:: سوپاس بۆ ئەو پەروەردگارەی بۆ جارێکی دی روحی هێنایەوە بەبەرمداو جەستەی ساغ و دروست کردم و یادوزیکری خۆی پی بەخشیم)).

---

[1] متفق عليه.

[2] رواه الترمذي وقال حديث حسن.

٣ ـ عَنْ عَائشَةَ (رضيَ اللهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبيِ(ﷺ) قَالَ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَقُولُ حِيْنَ يَرِدِ اللهُ تَعَالَى رُوحَهُ : (لاَ الَهَ الاَ اللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدْيِر) الاَ غَفَرَ اللهُ تَعَالَى ذنُوبَهُ وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ))[٣].

واتە: خاتوو (عائشە) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((هەر بەندەیەك كاتێ پەروەردگار بەئاگای هێناو رۆحی كردەوە بەبەریدا بڵێت: [ پەروەردگار تاكو تەنیاو بێ‌هاوتاو هاوەڵەو، دەسەڵاتو سوپاسگوزاری بۆئەوەو تواناو هێزی سەراپای بوونی گرتووەتەوە ] ئەوا پەروەردگار لەتاوانو گوناهەكانی دەبورێت ئەگەرچی بەئەندازەی كەفی سەر دەریاش بێت)).

## لەكاتی چوونە سەرپێشاو

٤ ـ عَنْ انس بنْ مالك (ﷺ) انَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ عِنْدَ دخُولِه الخَلاَءَ: ((اللهمَّ انِيَّ أعُوذُبِكَ مِنْ الخُبْثِ وَالخَبَائِث))[٤]

واتە: (انس) ی كوڕی (مالك) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەركات پێغەمبەری خوا (ﷺ) بچوایەتە

---

[٣] رواه ابن السني.
[٤] رواه الشيخان.

سەرپێشاو دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ پەنات پێدەگرم لەگەندەڵی و پیسی (یان پەری نێرو مێ)).

## لەکاتی هاتنە دەرەوە لەسەر پێشاو (سەرئاو)

٥ ـ عَنْ انس بنْ مَالك (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسولُ الله (ﷺ) اذا خَرَجَ مِنْ الخَلاءِ قَالَ : ((الحَمدُ لله الذي اذهَبَ عَني الأذى وَعَافَاني))[٥].

واتە: (انس)ی کوڕی (مالك) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەرکات پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەرپێشاو بەدەربکەوتایە دەیفەرموو: ((سوپاس و ستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی ئێش و ئازارو سەغڵەتی شکاندم و لەش ساغ و بێوەیی کردم)).

## دوعاکانی دەستنوێژ

## سەرەتاو پێشەکی

٦ ـ بِسْمِ الله ـ اوْ بِسْمِ اللهِ الرَحْمَنِ الرَحِيم.

واتە: ((بەناوی خوا ، یان بەناوی خوای گەورەو میهرەبان)).

---

[٥]رواه ابن ماجه.

# نزاو دوعای کاتی دەستنوێژ

٧ ـ عَنْ ابي مُوسَى الأشعَرِي (ﷺ) قَالَ: اتَيْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) وَهُوَ يَتَوَضأ فَسَمِعْتُهُ يَقُول: ((اللهُمَّ اغْفِرلِي ذَنْبِي وَوَسِعْ لِي فِي دَارِي وَبَارِكْ لِي فِي رِزْقِي)) قُلْتُ: يَا نَبِيَّ الله لَقَدْ سَمِعتُك تَدْعُو بِكَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: ((وَهَلْ تَرَاهُنَّ تَركنَ مِنْ شَئٍ))[٦].

واته: (ابی موسی)ی (اشعری) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەرو(ﷺ) لەوکاتەدا بینیم سەرقاڵی دەستنوێژ گرتنەو دەفەرموێت: ((پەروەردگارا؛ لەگوناهو تاوانەکانم ببورەو لانەو ماڵو رزق‌و بژێویم گوشادو فراوان بکە)) ، منیش پرسیم: ئەی فرستادەی خوا گوێم لەنزاکەت بوو؟ فەرمووی: ((واپەی نەبەیت نزاکەم هیچی بواردبێت ـ بەجێ هێشتبێت)).

# نزای دوای دەستنوێژ

٨ ـ عَنْ عُمَر بنْ الخَطَاب (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) مَنْ تَوَضأ فَأحْسَنَ الوُضُوءَ ثُمَّ قَالَ: (أشْهَدُ انْ لاَ الَهَ الاَّ الله وَحْدَهُ لاَشَرِيْكَ لَهُ وَاشْهَدُ انَّ محمداً عَبْدُهُ وَرسُولُهُ، اللهُمَّ

---

[٦] رواه النسائي وابن السني بأسناد صحيح.

اجعلْني مِنَ التَوابينَ واجْعَلْني مِنَ المُتَطَهِّرين)) فُتِحَتْ لَهُ ثَمَانِيَة أبواب الجنَّة يَدْخُل مِنْ أيُهَا شَاءَ))[٧].

واته: (عمر)ی کوڕی (خطاب) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هەرکەس دەستنوێژ بگرێت بەچەشنێکی جوان و دروست و پاشان بڵێ: [گەواهی دەدەم پەروەردگار تاك و تەنیاو بێهاوتایەو (محمد)یش (ﷺ) بەندەو پێغەمبەری خوایە، پەروەردگارا ؛ بمگێڕە لەتەوبەکارو بێگەردان] ئەوا هەشت دەرگای بەهەشتی لێ والاّ دەکرێت و ئازادە لەهەرکامیانەوە بچێتە نێو بەهەشت)).

## نزاوپاڕانەوەکانی بانگدان لەکاتی بانگداندا

٩ ـ قَالَ أبو سَعْيد (ﷺ) : قَالَ رَسُولَ الله (ﷺ) : (( اذَا سَمِعْتُم النداءَ فَقُولوا مِثْلَ مَا يَقُولُ المؤذِن))[٨].

واته: (ابوسعيد) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: (( هەرکات گوێبیستی بانگ بوون بەچەشنی بانگبێژ بڕگەکانی دوویات بکەنەوە)).

---

[٧] رواه مسلم والترمذي.

[٨] متفق عليه.

١٠ ـ قَالَ عُمَر (ﷺ) قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): ((اذا قَالَ المُؤذِنُ ـ الله أكْبَر ـ الله أكْبَر ـ فقَال احَدُكُمْ الله اكْبَر ـ الله اكْبَر ، ثُمَ قَالَ اشْهَدُ انْ لاَ الَهَ الاَ الله قَالَ: اشْهَدُ انْ لاَ الَهَ الاَ الله ثُم قَالَ : اشْهَدُ انَّ مُحَمَداً رَسُولُ الله قَالَ: اشْهَدُ انَّ مُحَمَداً رَسُولُ الله ثُمَّ قَالَ: حَيٌ عَلَى الصَلاَة قَالَ : لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَةَ الاَ بِالله ، ثُمَّ قَالَ: حَيٌ عَلَى الفَلاَح قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَةَ الاَ بِالله ، ثُمَّ قَالَ: الله أكْبَر ، الله أكْبَر قَالَ: الله أكْبَر ، الله أكْبَر ، ثُمَّ قَالَ: لاَالَهَ الاَ الله قَالَ: لاَ الَهَ الاَ الله مِنْ قَلْبِهِ دَخَلَ الجَنَّةَ))[٩].

واتە: (عمر)ی کوڕی (خطاب) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هەرکات بانگبێژ وتی: (الله اکبر ، الله اکبر) بەدوایدا بڵێن (الله اکبر ، الله اکبر)و، کاتێ وتی: (اشْهَدُ انْ لاَ الَـهَ الاَ الله) بڵێن: (اشْهَدُ انْ لاَ الَـهَ الاَ الله)، کەوتیشی(اشْهَدُ انَّ مُحَمَداً رَسُولُ الله)بڵێن: (اشْهَدُ انَّ مُحَمَداً رَسُولُ الله) ، کاتێکیش (حَيٌ عَلَى الصَلاَة)و(حَيٌ عَلَى الفَلاَح)ی وت بڵێن: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَةَ الاَ بِالله)، ئنجا لەگەڵ وتنی (الله أكبر) بەچەشنی خۆی دووبارەی بکەنەوەو دوواینجاریش وتنی (لاَالَهَ الاَ الله) بڵێنەوە هەرکەسێك دووپاتی بڕگەکانی بانگ بەم چەشنە بکاتەوەو، لەدڵەوە کەمەندکێش بووبێت دەچێتە بەهەشتی بەرینەوە)).

---

[٩] رواه مسلم وابوداود.

## نزاو دوعای دوای بانگ

١١ ـ عَنْ جَابِرِ بنْ عَبْدُاللهِ (ﷺ) انَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: مَنْ قَالَ حِيْنَ يَسْمَعُ النداءَ: ((اللهُمَّ رَبَّ هَذهِ الدعْوَةِ التَامَةِ وَالصَلاَةِ القَائمَةِ ات مُحَمَداً الوَسِيلَةَ وَالفَضِيلَةَ ـ وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداً الذِي وَعَدْتَهُ. حلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ القِيَامَةِ))[١٠]

واتە: (جابر)ی کوڕی (عبدالله) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((هەرکەسێك گوێی لەبانگ بوو بڵێ: [پەروەردگارا؛ ئەی خاوەن نزای تەواوو نوێژی بەجێو نەخشین ببەخشە بە(محمد) (ﷺ) ڕێزو شکۆمەندی بالاو ئەو پلەوپایە مەزنەی بەڵێنت پێداوە] ئەوا شەفاعەتم مسۆگەرە بۆی لەڕۆژی قیامەتدا)).

## نزاو دوعاکانی مزگەوت

## لەکاتی چوون بەرەو مزگەوت

١٢ ـ عَنْ عَبْدُاللهِ بن العَبَاس (ﷺ) انَّ النَبيَّ (ﷺ) خَرَجَ الى المَسْجِدِ وَهُوَ يَقُولُ: ((اللهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُوراً وَفِي سَمْعِي نُوراً وَعَنْ يَمِينِي نُوراً وَعَنْ يَسَارِي نُوراً وَفَوقِي نُوراً وَتَحْتِي نُوراً وَخَلْفِي نُوراً وَاجعَل لِيَّ نُوراً))[١١].

---

[١٠] رواه البخاري.

[١١] رواه البخاري.

واتە: (عبدالله) ی کوڕی (عباس) - ڕەزای خوایان لێبێت - دەفەرموێت: هەرکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڕێدەکەوت بۆ مزگەوت بەدەم ڕێگەوە دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ نورو ڕووناکی بخەرە نێو دڵو چاوو گوێو لای ڕاستو چەپو سەرو خوارو، بالاپۆشم کە بەنوورو ڕووناکی)).

## نزاو دوعای چوونە ناو مزگەوت

١٢ - عَنْ فَاطِمَةَ الزَهْرَاء (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) اذا دَخَلَ المَسْجِدَ قَالَ: (بِسْمِ الله وَالسَلاَمُ عَلَى رَسُولِ الله ، اللهُمَّ اغْفِرْ لِي ذنُوبِي وَافْتَحْ لِي أَبْوابَ رَحْمَتِك))[١٢].

واتە: خاتوو (فاطمە)ی (زهراء) - ڕەزای خوای لێبێت - دەفەرموێت: هەرکاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بچوایەتە ناو مزگەوت دەیفەرموو: ((بەناوی خواو؛ سڵاوبێت لەدیاری پێغەمبەرەکەی، پەروەردگارا؛ لەگوناهو تاوانەکانم ببورەو دەروازەی سۆزو بەزەیی خۆتم لێ والاّ بکە)).

---

[١٢] رواه احمد والطبراني.

## نزاو دوعای هاتنە دەرەوە لەمزگەوت

١٤ ـ وَعَنْهَا أيْضاً قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) اذَا خَرَجَ مِنَ المَسْجِدِ قَالَ: بِسْمِ اللهِ وَالسَلامُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ، اللهُمَّ اغْفِرْ لِي ذنُوبِي وَافْتَحْ لِي أبْوابَ فَضْلِكَ))[١٣].

واتە: هەروەها خاتوو(فاطمە) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەركات پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەمزگەوت بەدەربكەوتایە دەیفەرموو: ((بەناوی خواو سلاو لەدیاری پێغەمبەری خوا ، پەروەردگارا؛ لەگوناهو تاوانەكانم ببورەو دەروازەی رێزو شكۆمەندیم بۆ والاّ بكە)).

## دوعاكانی سەرخوان و نا نخواردن

١٥ ـ قَالَ عُمَرُ بن أبِي سَلَمَة (رضي الله عنه) قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : (يَا بُنَيَّ سَمِي اللهِ ، وَكُل بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَا يَلِيكَ))[١٤].

واتە: (عمر)ی كوڕی (ابی سلمه)ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی وتم: ((ڕۆڵەكەم ناوی خوا بهێنەو بەدەستی ڕاستو لەبەرەوە بخۆ)).

---

[١٣] رواه أحمد والطبراني.

[١٤] متفق عليه.

١٦ـ عَنْ عَبْدَالله بنُ عَمْرو (ﷺ) عَنِ النَّبي (ﷺ) انَّـهُ كَـانَ يَقُولُ فِي الطَعام اذا قَرَبَ اِلِيهِ : ((اللهُمَّ بارك لَنَا فيمَا رَزَقْتَنَـا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ))[١٥].

واتـه: (عبـدالله)ى كـوڕى (عمـر) ـ ڕەزای خـوای لێبێـت ـ سەبارەت بـەنانخواردنی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەفـەرموێت: كـاتێ خوانێـــك دەخرایـە بـەردەم پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) دەیفەرموو: ((پەروەردگارا! فەڕو بەرەكەت بخە ئەم بژێوی‌و رزقەوەو، لەسزاو خەشمی ئاگر بەدوورمان بگرە)).

١٧ ـ وَقَالَتْ عَائشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْه): قَالَ رَسُولَ الله(ﷺ) : اذا اكل احَدَكُمْ فَلْيَذْكُرِ اللهَ تَعَالَى فِي اوَّلِهِ فَلْيَقُـلْ: (بِسْـمِ اللهِ اوَّلُهُ وَاخِرَهُ)[١٦].

واتــه: خـــاتوو (عائشـــه) ـــ ڕەزای خـــوای لێبێـــت ـــ لەپێغەمبـــەری خـــواوە (ﷺ) دەگێڕێتـــەوە ؛ دەفــــەرموێت: ((هەركاتێك نانتان خوارد لەسەرەتاوە ناوی خوا بهێنن‌و، خۆ ئەگەر لەبیرتان چوو دواتر بیرتان كەوتەوە بڵێن: بەناوی خوا لەسەرەتاو كۆتاییی‌یەوە)).

---

[١٥] رواه ابن السني.

[١٦] قَالَ التِرمذيُ حَدْيثٌ حَسَنٌ صَحْيحٌ.

# دوعای دوای نانخواردن

١٨ ـ عَنْ ابي امَامَةَ (رضي الله عنه) انَّ النَّبيَّ (ﷺ) كَانَ اذا رَفَعَ مَائِدَتَهُ قَالَ: (الحَمْدُ لله كَثيراً طَيِّباً مُبَارَكَا فِيهِ غَيْر مَكْفِيٍ وَلاَ مُوْدِعٍ وَلاَ مُسْتَغْنِي رَبَنَا))[١٧].

واتە: (ابی امامە) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: کاتێ خوانی نانخواردن دەپێچرایەوەو هەڵدەگیرا لەبەردەستی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەیفەرموو: ((سوپاسێکی بێپایان بۆ پەروەردگار ؛ کەوا بژێوی‌و رزقی پاك‌و پوختی پێداین‌و ملکەچی بەرقاپی کەسی دیکەی نەکردین‌و، بەبێ خوانیش فەرامۆش‌و سەرگەردانی نەکردین)).

١٩ ـ عَنْ ابي سَعْيدِ الخُدَرِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولِ الله(ﷺ) اذا فَرِغَ مِنْ طَعَامه قَالَ: ((الحَمْدُ لله الذيِّ أطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَجَعَلَنَا مُسْلِمِين))[١٨].

واتە: (ابی سعید)ی (خدری) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەرکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەنانخواردن تەواو ببوایە دەیفەرموو:((سوپاس‌و ستایش بۆ پەروەردگار کەوا تێرنان‌و ئاوی کردین‌و بەموسوڵمانی گێڕاین)).

---

(١٧) رواه البخاري وأحمد والترمذي.

(١٨) رواه احمد والضياء وابوداود والترمذي والنسائي وابن ماجه.

# نزاو دوعاكانی بەرگ پۆشینو بەرئاوێنە

## بەرگ پۆشین

٢٠ . عَنْ أبِي سَعْيدِ الخُدْرِيّ (ﷺ) أنَّ النَّبيَّ (ﷺ) كَانَ اذا لَبِسَ ثَوْبَاً سَمَّاهُ بِاسْمه قَمْيصَاً أوْ رِداءاً أو عَمَامَةً يَقُول: ((اللهُمَّ انِي أسْألُكَ مِنْ خَيْرِهِ وَخَيرِ مَا هُوَ لَهُ وَاعُوذُ بِكَ مِن شَرِهِ وَشَرِ مَا هُوَ لَهُ))(١٩).

واتە: (ابی سعید)ی (خدری) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەركات پێغەمبەری خوا(ﷺ) كراسو عەباو مێزەری بپۆشیایە ناوی دەبردو دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ خوازیاری خێروچاكەی ئەم پۆشاكەمو ئەو خێرەش بەم پۆشاكەوە دەستگیرم دەبێت ، پەناشدەگرم بەتۆ لەشەڕو خراپەی ئەم پۆشاكەو ئەوەی بەهۆیەوە دێتە رێم)).

## لەكاتی داكەندنی پۆشاكدا

٢١ ـ عَنْ أنس بنْ مَالكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) : ((سِتْرُ مَا بَيْنَ اعْيُنِ الجنِيّ وَعَوراتُ بَنِي ادم انْ يَقُولَ المُسْلِمُ اِذا أرَادَ انْ يَطْرَحَ ثِيَابَهُ: بِسْمِ اللهِ ، الذيّ لاَ الِهَ الاَ هُوَ))(٢٠).

---

(١٩) رواه ابن السني.

(٢٠) رواه ابن السني.

واتــە: (أنــس)ی کــوڕی (مــالك) ــ ڕەزای خــوای لێبێــت ــ لەپێغەمبـەری خـواوە دەگێڕێتـەوە ؛ دەفەرموێت: (بەربەسـتی نێـــوان چـــاوو دییـــەی جنۆکـــەو عـــەورەتی مـــرۆڤ جل‌وبەرگەکانیەتی ، کاتێك مرۆڤ جل‌و بەرگەکانی لەخۆی داماڵی بابڵێت: ((بەناوی ئەو پەروەردگارەی تاك‌و تەنیایە)).

## دوعاکردن لەکاتی تەماشاکردنی ئاوێنەدا

٢٢ ـ عَنْ انَس (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) اذا نَظَرَ فِي المراة قَالَ: الحَمْدُ لله الذي سَوَى خَلْقِي وَاحْسَنَ صُورَتِي وزَانَ مِنِّي مَاشَانَ مِنْ غَيْرِي))[٢١].

(انــس) ــ ڕەزای خــوای لێبێــت ــ دەفــەرموێت: کــاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەماشای ئاوێنەی بکردایە دەیفەرموو: ((ســوپاس‌و ســتایش بــۆ ئــەو پــەروەردگارەی بــەجوانی دروستی کردوم‌و شێوازی نەخشاندوم، ئەوەشی بەخەڵکی دیکەی نەداوە بەمنی بەخشیوە)).

٢٣ ـ وعَنْ عَلِيٍّ (ﷺ) انَّ النبيَّ (ﷺ) كَانَ اذا نَظَرَ ((وَجْهَهُ)) فِي المراة قَالَ: (الحَمْدُ لله ، اللهُمَّ كَمَا حَسَّنْتَ خَلْقِي فَحَسِّنْ خُلُقِي))[٢٢].

---

[٢١] رواه البزار.

[٢٢] ابن السني.

واتــە: (علــی) ــ ڕەزای خــوای لێبێــت . دەفــەرموێت: هــەرکاتێك پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) لەڕووخســاری خــۆی وردببوایەتــەوە لەبەرئاوێنــەدا دەیفــەرموو: ((ســوپاس‌و ستایش بۆ خـوای گـەورە ؛ پـەروەردگارا؛ هـەروەك چـۆن ڕووخسارو ڕووت جوان نەخشاندوم بەو چەشنەش ڕەوش‌و ڕەفتارم چاك‌و باش بکە)).

# دوعاکانی تایبەت بەماڵ‌و لانە

## دوعای کاتی هاتنە دەرەوە لەماڵەوە

٢٤ ـ عَنْ انَسٍ انَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: مَنْ قَالَ ـ يَعْنِي اذا خَرَجَ مِنْ بَيْتِه : بِسْمِ الله تَوَكَلْتُ عَلَى الله وَلاَ حَولَ وَلاَ قُوَةَ الاَ بِالله) ـ يُقَالُ لَهُ كُفِيتَ وَهُدِيْتَ ـ وَتَنَحَى عَنْهُ الشَيْطَان فَيَقُولَ لِشَيْطَانٍ اخَرَ:كَيْفَ بِرَجُلٍ قَدْ هُدِيَّ وَكُفِيَ وَوُقِيَ))[٢٣].

واتە: (انس) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتــەوە ؛ دەفــەرموێت: ((هەرکەســێك لــەماڵ بەدەربکەوێت‌و بڵێت: [بەناوو پشتیوانی خـوا بەڕێکەوتم‌و، هیـچ هـێزو دەسـتەڵاتێك نی‌یـە جگـە لـەهێزو دەسـتەڵاتی پەروەردگار نەبێت] ئەوجا فریشتەکان پێی دەڵێن: لەڕاستیدا ئەم نزایەت بەسەو پارێزراو ڕێنموویی کرایت)).

---

[٢٣] رواه ابوداود.

٢٥ ـ وَعَنْ انَس ايْضَاً (ﷺ): ((بِسْمِ الله امَنْتُ بِاللهِ اعْتَصَمْتُ بِاللهِ ، تَوَكَلْتُ عَلَى اللهِ ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَةَ الاَ بِاللهِ))[٢٤].

واتە: هەر لە(انس)ەوە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕنەوە دەفەرموێت: ((بەناوی خوا باوەڕو پەنام هەر بەخوایەو ، بەپشتیوانی پەروەردگار بەرێکەوتمو هیچ هێزو دەستەلاَتێك نییە جگە لەخوای گەورە)).

## دوعای کاتی چوونە ماڵەوە

٢٦ ـ عَنْ ابِي مَالكٍ الأشْعَرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): ((اذَا وَلَجَ الرَجُلُ بَيْتَهُ فَلْيَقُلْ : اللهُمَّ انِي أسْألُكَ خَيْرَ المُولِجِ وَخَيْرَ المَخْرَجِ ، بِسْمِ اللهِ وَلَجْنَا بِسْمِ اللهِ خَرَجْنَا ، وَعَلَى اللهِ رَبِنَا تَوَكَلْنَا ، ثُمَّ لِيَسْلِمِ عَلَى اهْلِهِ))[٢٥].

واتە: (ابی مالك)ی (اشعری) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((کاتی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە بڵێن: پەروەردگارا ؛ خوازیاری خێرێکی بێشومارم لەدەرچوونو گەڕانەوەمدا، بەناوی خوا گەڕاینەوە بۆماڵو هەر بەناوی ئەویش بەدەرکەوتینو پەناو پشتگیرمان پەروەردگارە ، پاشان باسلاَو لەخاوخێزانی بکات)).

---

[٢٤] في مسند احمد حديث حسن.

[٢٥] اخرجه ابوداود واسناده صحيح.

## نزاو دوعای دوایی هێنان بەکۆڕو دانیشتن

٢٧ ـ عَنْ ابي بَرْذَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَقُولُ بأخِرَة (اخرِ الأمْرِ) اذا أراد أن يَقُومَ مِنْ المَجْلِسِ : ((سُبْحَانَكَ اللهُمَّ وَبِحَمْدِك، اشْهَدُ انْ لاَ الهَ الاَ انْتَ اَسْتَغْفِرُكَ وَاتوبُ الَيْكَ)) فَقَالَ رَجُلٌ يَارَسُولَ الله انَّكَ لَتَقُولُ قَولاً مَاكُنْتَ تَقُولُهُ فيمَا مَضَى ؟ قَالَ: ذَلِكَ كَفَارَةُ لِمَا يَكُونُ فِي المَجْلِسِ))[٢٦].

واتە: (ابی بردة) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەرکات پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکۆڕو دانیشتنێك هەڵبسایە لەکۆتاییەکەیدا دەیفەرموو: پەروەردگارا؛ ستایش و بێگەردی بۆ تۆ ، گەواهی تەنیایی تۆ دەدەم و تەوبەبێت خوایە گیان)) پیاوێکیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ گوتەیەك دەڵێیت پێشتر نەت وتوە؟ فەرمووی: ((ئەم وتەیە پاکەرەوەی کەم و کوڕی نێو کۆڕو دانیشتنەکەیە)).

٢٨ ـ وَعَنْ عَلِيٍّ (ﷺ) قَالَ: مَنْ احَبَّ انْ يَكْتَالَ بِالْمِكيَال الأدْنَى فَلْيَقُل فِي اخرِ مَجْلِسه أوْ حِيْنَ يَقُومُ: (سُبْحَانَ رَبِكَ رَبِ العِزَة عَمَّا يَصِفُونَ وَسَلاَمٌ عَلَى المُرْسَلِينَ وَالحَمْدُ لله رَبِّ العَالَمِينَ))[٢٧].

---

[٢٦] رواه أبوداود والحاكم في المُستَدرَك.

[٢٧] رواه أبوداود في الحلية.

واتــە: (علــی) ـ ڕەزای خــوای لێبێــت ـ دەفــەرموێت: هەرکەســێك بیــەوێت بەســەنگی تــەواوو دادپەروەرانــە هەڵبســەنگێنرێ با لــەکۆتایی کــۆڕو دانیشــتنەکەیدا بڵێــت: ((پــاکی و بێگــەردی بــۆ پــەروەردگار، پــەروەردگاری خــاوەن دەسەڵات ، لەوەی کەئەوانە دەیدەنەپاڵ ئەو زاتە بێ هاوەڵو هاوتایــە ، ســلاّوودرودیش لەســەر پێغەمبــەران و ســەرجەم فرســتادەکانی خــواو، ســوپاس و ســتایش بــۆ خــوا، پەروەردگاری هەموو جیهانان هەمیشەو بەردەوام))[٢٨].

## نزاو دوعا لەکاتی نووستندا

٢٩ ـ قَالَ حُذَيْفَةَ بنُ اليَمَان (ﷺ) : كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) اِذَا اَرادَ اَن يَنَامَ قَالَ: ((بِأسْمِكَ اللهُمَّ أموتُ وَاَحْيَا))[٢٩].

واتــە: (حذیفــە)ی کوڕی (یمــان)ـ ڕەزای خــوای لێبێــت ـ دەفەرموێت: هەرکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیویستایە بنوێت دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ بەناوی تۆوە دەمرم و دەژیم)).

٣٠ ـ عَنْ عَائشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أنَّ النَّبيَ (ﷺ) كَانَ اِذَا اَوَى اِلَى فِرَاشِه كُلَّ لَيْلَةِ جَمَعَ كَفَيه ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا [قُلْ هُــوَ اللهُ أحَد ]و [قُلْ أعُوذُ بِرَبِ الفَلَق] و[قُلْ أعُوذُ بِرَبِ النَّــاس] ثُمَّ يَمْسَحُ

---

[٢٨] تەفسیری ئاسان: ٤٥٢.

[٢٩] متفق علیە.

بِهِمَا مَا اسْتَطاعَ مِنْ جَسَدِهِ يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ، يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَاتٍ))[٣٠].

واتە: (عائشە) ـ رەزای خوای لێبێت ـ سەبارەت بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: کاتێك دەچووە سەر جێگە بۆ نووستن هەموو شەوێك دەستی خڕدەکردەوەو فووی پیا دەکردو هەریەك لەسوورەتەکانی: [قُلْ هُوَ اللهُ أحَد]و [قُلْ أعُوذُ بِرَبِ الفَلَق] و[قُلْ أعُوذُ بِرَبِ النَّاس] ی دەخوێندو لەتەوقی سەرییەوە هەتا سەرجەم جەستەی دەستی پیا دەهێنا و بۆ سێجار دووبارەی دەکردەوە)).

٣١ ـ وَعَنْ البَراء بِنْ عَازِبْ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) اذَا اتَيْتَ مَضْجِعَكَ فَتَوَضَأ وُضُوءَكَ لِلْصَلاَةِ ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شَقكَ الأيْمَن ثُمَّ قُلْ: اللهُمَّ اسْلَمْتُ نَفْسِي الَيْكَ ـ وَوَجَهْتُ وَجْهِي الَيْكَ ـ وَفَوَضْتُ أمْرِي الَيْكَ ، وَالْجَأتُ ظَهْرِي الَيْكَ ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً الَيكَ لاَ مَلْجَأ وَلاَ مَنْجَى مِنْكَ الاَ الَيْكَ امَنْتُ بِكِتَابِكَ الذِيٌ أنْزَلْتَ وَبِنَبِيكَ الذيٌ أرْسَلْتَ))[٣١].

واتە: براء)ی کوڕی (عازب) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: کاتێك چوویتە سەرجێگە بۆ نووستن دەست بەدەستنوێژبەو ئەوجا

---

[٣٠] متفق عليه.

[٣١] متفق عليه.

بەلای راستدا پاڵ بکەوەو بڵێ: ((پەروەردگارا ؛ هەرتۆ مەزنیت و بەویستی خۆم پشت و نەفس و رووکارم بە تۆ سپاردوە، هیچ پەناو پشتگیرو لانەیەك نی‌یە رووی تێ بکەم لای تۆ نەبێت ، خوایە گیان باوەڕم هێناوە بەوپەرتوکەی نازڵتکردووە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەی بەفرستادە رەوانەتکردووە)).

٣٢ ـ عَنْ ابنُ مَسْعُودِ الأنْصَارِيُّ (ﷺ) عَنْ النَبيٍّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ قَرَأ الايَتَينِ مِنْ اخرِ سُورَةِ البَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ))[٣٢].

واتە: (ابن مسعود) ی (انصاری) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی هەموو شەوێك دوو ئایەت لەکۆتایی سوورەتی (البقرة)بخوێنێتەوە بێگومان دەبێتە قەڵغان و سوپەرو بەرگری بۆی)).

٣٣ ـ وَعَنْ علِيُّ (ﷺ) انَّ فَاطمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أتَتِ النَّبِيَ (ﷺ) تَسْألُهُ خَدماً فَلَمْ تَجِدْهُ ، وَوَجَدَت عَائشَةَ فَأخْبَرَتْهَا قَالَ عليُّ: فَجَاءَنَا النَّبِيُ (ﷺ) وَقَدْ اخَذْنَا مَضَاجِعَنَا وَقَالَ: الاَ ادُلكُمَا عَلَى مَا هُوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادمٍ اذَا أوِيْتُمَا الَى فِرَاشِكُمَا فَسَبِحَا ثَلاَثَاً وَثَلاَثِيْنَ ، وَاحْمَدَا ثَلاَثَاً وَثَلاَثِينَ، وَكَبِرَا أرْبَعَاً وَثَلاَثِينَ فَأنَهُ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ ))قَالَ عَلِيُّ : فَمَا

---

[٣٢] متفق عليه.

تَرَكْتُهُنَّ مُنذُ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قِيلَ لَـهُ: وَلاَ لَيْلَـةَ صِفِّينَ؟ قَالَ: وَلاَ لَيْلَةَ صِفِّينَ))[٣٣].

واتـه: (علـی) ــ ڕەزای خـوای لێبێـت ــ دەفـەرموێت: (فاطمـه)ڕەزای خوای لێبێت . چوو بۆ خزمەتی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هـەتا خزمـەتكارێكیان بداتـێ ، بـەڵام لەوكاتـەدا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـەوێ نـەبوو نیـازووزازی لای (عائشـه) باسكردو پاشان گەڕایەوه بۆ مـاڵی خۆیـان، پاشـان (علـی) دەفەرموێت: لـەكاتێكدا پاڵكەوتبووین پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هـات بۆلامـان و فەرمووی: بارێنومایتـان بكـەم بۆ زانیارییـەك زۆر لەخزمەتكار باشتره بۆتان، هەركات چوونه سەر جێگه بۆ نووستن سی‌وسێ‌جار (سبحان الله)و (الحمد لله)و سی‌وچوار جاریش (الله اكبر) بكەن‌و ئەم ویرده زۆر لەخزمەتكار باشتره بۆتان)) ، ئنجا (علی) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفـەرموێت: لەوكاتـەوه ئـەم فەرمودەیـەم بیسـت دەستبەرداری نـەبووم‌و بەردەوام بـووم لەسەری، ئامادەبووانی دەوریشـی پرسـیان: ئاخۆ شەوی جەنگی (صفین)یش هـەر ئـەم ویردەت وتـووه‌و توانیوتـه بـەردەوام بیـت لەسـەری ؟ فـەرمووی: بـەڵی لەوشەوەشدا وەك خۆی پارێزگاریم لێكرد..

---

[٣٣] متفق علیه.

# بەشی چوارەم

نزاو دوعای بۆ نەكان

نزاو دوعای سەرپشككردنی شەرعی

نزاو دوعای كاتی سەفەر

نزاو دوعای ڕووداوە كتوپڕەكان

نزاو دوعای دیمەنە بەرچاوو دیارەكان

نزاو دوعای دیاردە سروشتی و گەردونییەكان

نزاو دوعای كاتی نەخۆشی و مردن

نزاو دوعای كاتە جیاجیاكان

# نزاو دوعای سەرپشك كردن

١ـ عَنْ جَابِرِ بنُ عَبْدالله (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُعلمنَا الأستخارَةَ في الأمُور كمَا يُعلمنَا السُورَةَ من القُران يَقُولُ: ((اذَ هَمَّ احَدُكُمْ بالأمْر فَليَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ منْ غَيْرِ الفَريْضَة ثُمَّ ليَقُل: اللهُمَّ انِي اسْتَخيْرُكَ بعلمكَ واسْتَقْدرُكَ بِقُدْرَتك وَاسْألُكَ منْ فَضْلكَ العَظيم فأنَكَ تَقْدرُ وَ لاَ اقْدرُ وَتَعْلَمُ وَلاَ اعْلَمُ وَانْتَ عَلاّمُ الغُيُوب . اللهُمَّ انْ كُنْتَ تَعْلَمُ انَّ هَذَا الأمْرِ خَيْرٌ لي في دِيْنِي وَمَعَاشي وَعَاقبَةُ امْرِي ، اوْ قَال عَاجِلِ امْرِي وَاجِلِه فَاقْدرْهُ لِي وَيَسرْهُ لي في ديْني وَمَعَاشي وَعَاقبَة امْرِي ، اوقال في عَاجِلِ أمْرِي وَاجلِهُ فَاصْرِفْهُ عَنّي ، وَاصْرِفْنِي عَنْهُ ، وَاقْدرْ لِي الخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ رَضني به ] قَالَ وَيُسَمي حَاجَتُهُ))[١].

واتە: (جابر)ی كوڕی (عبدالله) . ڕەزای خوایان لێبێت . دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەچەشنی فێركردنی سوورەتێكی قورئان فێری ڕاوێژكردنی دەكردین و دەیفەرموو: هەركاتێك یەكێكتان ویستی كارێك ئەنجام بدات باهەڵبسێت بەئەنجامدانی دووڕكات نوێژ بەدەر لەنوێژە فەرزەكان و، دوای دوو ڕكاتەكە بڵێ: پەروەردگارا؛ بەزانیاری

[١] رواه البخاري.

خـۆت راوێـژت پێدەکـەمو بەتواناشـت پـەنات پێدەگـرمو داواخـوازم لەمـەزنیو شـکۆمەندی تـۆو بەتـەنیا هـەر تـۆ دەتوانیـتو زانیاریت هەیەو خاوەنی گەنجینەکانی غـەیبو پەنهانیت. پـەروەردگارا؛ گـەر ڕەخسـاندنی ئـەم کـارە خـێرو چاکەی ئاینو بژێویو دوایین دەرەنجامی ژینمی تێدایە ئەوا بۆم فەراهەم بهێنەو ئاسانو سووکی بکەو فەڕو بەرەکەت بخە نێوی ؛ خۆئەگەر ئەم کارە شـەڕو خراپـەی ئـاینو بژێـویو دوایین دەرەنجامی ژینمی تێدایە لێم دووربخەرەوەو دڵیشم هەڵبکەنـە لەسـەریو خـێرو چاکـە بهێنـە رێـم لەهـەر دەوروبارێکدا بێتو پاشان رازیو دڵگەرمم بکـە لەسـەری ، ئەوجا فەرمووی: باناوی کارو فرمانەکەی بەرێت)).

## دوعاکانی سەفەر

## دوعـای کەسێکی جێنشین بۆ یەکێك سەفەر بکات

وَقَالَ سَالِمْ: كَانَ ابنُ عُمَرْ (ﷺ) يَقُولُ لِلرَّجُلِ اِذَا اَرَادَ سَفَرَاً: اِدْنُ مِنّـِي أُوَدِّعـكَ كَمَـا كَـانَ رَسُـولُ الله (ﷺ) يُوَدِّعُنَـا فَيَقُـولُ: [أَسْتَوْدِعُ اللهَ دِيْنَكَ وَأَمَانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ ][٢] ثُـمَّ يُوَصِيـهِ فَيَقُولُ: [عَلَيْكَ بِتَقْوَى اللهِ وَالتَكْبِيرُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ اللهُمَّ اُطْوِلَهُ البُعْدَ وَهَوِنْ عَلَيْهِ السَفَرَ][٣] .

---

[٢] قال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح.

[٣] رواه الترمذي والنسائي من حديث أبي هريرة.

واتە: (سالم) دەڵێت: هەر کەسێك بۆ سەفەر بچوایە (ابن عمر) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ پێی دەوت: وەرە باخواحافیزیت لێ بکەم بەچەشنی خواحافیزی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ئێمە ، ئنجا دەیفەرموو: ((خوا ئاین و ئەسپەردەو کۆتای کردارەکانت بپارێزێت ))، پاشان ئامۆژگاری دەکردو دەیفەرموو: ((لەخوا بترسەو بەمەزنی ڕابگرە لەسەر هەموو کردارێکی جوان، پەروەردگارا ڕێگای دوورو درێژی بۆ کورت بکەرەوەو ناڕەحەتی و سەغڵەتی سەفەری بۆ ئاسان بکە )).

# دوعای ئەوکەسەی سەفەر دەکات بۆ کەسانی جێنشین

٣ ـ ((اسْتَوْدِعُ اللهَ الذيّ لاَ تُضيعُ وَدَائِعُهُ))[٤].
واتە: ((دەتانسپێرم بەو پەروەردگارەی هەرگیز ئەسپەردە زایە ناکات)).

# دوعای سواربوونی هۆکارەکانی گواستنەوە (ئوتومبیل ، فرۆکە ، شەمەندەفەر، ..)

٤ ـ وَعَنْ اِبنُ عُمَر (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) اذا اسْتَوَى عَلَى بَعِيرِهِ خَارِجَاً اِلَى سَفَرِ كَبَّرَ ثَلاَثَاً ثُمَّ قَالَ : ((سُبْحَانَ الذيِّ

---

[٤] رواه الطبراني من حديث ابي هريرة.

سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ ، اللهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى ، اللهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا ، وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ ، اللهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ، اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ فِي الْمَالِ وَالأَهْلِ وَالْوَلَدِ)) وَإِذَا رَجَعَ قَالَهُنَّ وَزَادَ فِيهِنَّ: ((آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ ))[٥].

واتە: (ابن عمر) ـ رەزای خوایان لێبێت ـ دەفەرموێت: هەرکاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) بچوایەتە سەرپشتی وشترەکەی‌و بەرێ‌بکەوتایە بۆ سەفەرێك سێ‌جار (الله اكبر)ی دەکردو ئنجا دەیفەرموو: (بێگەردی‌و پاکی بۆ ئەو پەروەردگارەی ئەم هۆکارەی بۆ بەگەڕخستین گەرچی توانامان نەبوو بۆی‌و هەمووش بۆلای پەروەردگار دەگەڕێینەوە ، پەروەردگارا ؛ لەم سەفەرەدا خوازیاری چاکەو خواناسی‌و ڕەفتارێکین تۆ پێی ڕازی بیت ، خوایە گیان نارەحەتی‌و ناکامیەکانی سەفەرمان لەسەر ئاسان بکەو بەردەوامیش واما لێبکە هەر بۆ تۆ گوێڕایەڵ بین ، پەروەردگارا ؛ تۆ هاوڕێی سەفەرو جێنشینی نێو خاوخێزانیت ، پەروەردگارا ؛ پەنات پێدەگرم

---

[٥] رواه مسلم .

لەناسۆریەکانی سەفەرو دیمەنی دڵتەزێنو غەم هەڵگرو گەڕانەوە بەسەر حاڵێکی خراپو نابارى خاوخێزانو وەچەکانم ) ، کاتێکیش دەگەڕایەوە بەهەمان چەشنی دەوتو ئەم دەستەواژەیەی تێدا زیاد دەکرد: ((گەڕاینەوەو تەوبەو بەندایەتیو سوپاسگوزاریمان هەر بۆ پەروەردگارە)).

## دوعای گەڕانەوە لەسەفەر پاش سواربوونی هۆکارەکانی گواستنەوە

((سُبْحَانَ الذيْ سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِين وَانَّا الَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُون. اللهُمَّ انَّا نَسْألُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا البِّرَ وَالتَّقْوَى وَمِنَ العَمَلِ مَا تَرْضَى . اللهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطْوِعْنَا بَعْدَهُ . اللهُمَّ أنْتَ الصَاحِبُ فِي السَفَرِ والخَلِيفَةَ فِي الأهْل. اللهُمَّ انِّي أعُوْذُبِكَ مِنْ وَعْثَاء السَفَر وكَأبَةَ المَنْظَرِ وَسُوءُ المُنْقَلَبِ فِي الأهْلِ وَالوَلَدِ ، ايبُون تَائِبُونَ عَابِدُون لِرَبِنَا حَامِدُون)).

واتە: ((بێگەردیو پاکی بۆ ئەو پەروەردگارەی ئەم هۆکارەی بۆ بەگەڕخستین گەرچی توانامان نەبوو بۆیو، هەمووش بۆلای پەروەردگار دەگەڕێینەوە ، پەروەردگارا؛ لەم سەفەرەدا خوازیاری چاکەو خواناسیو ڕەفتارێکین تۆ پێی ڕازی بیت ، خوایە گیان نارەحەتیو ناکامیەکانی سەفەرمان لەسەر ئاسان بکەو واشمان لێ بکە بەردەوام بۆ تۆ

گوێڕایەڵبین ، پەروەردگارا؛ تۆ هاوڕێی سەفەرو جێنشینی نێو خاو خێزانیت، پەروەردگارا؛ پەنات پێدەگرم لەناسۆرییەکانی سەفەرو دیمەنی دڵتەزێن و غەم هەڵگرو گەڕانەوە بەسەر حاڵێکی خراپ و نابارى خاوخێزان و وەچەکانم ، خوایەگیان واگەڕاینەوەو تەوبەو بەندایەتی و سوپاسگوزاى هەر بۆ تۆیە)).

## دوعاکانی ڕووداوە کتوپڕەکانی ژیان

## دوعای بەلاّو غەمو پەژارە

٥ـ عَنْ ابْنِ عَبَاسٍ (ﷺ) ، انَّ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الكَرْبِ : ((لاَ الَهَ الاَّ اللهُ العَظِيمُ الحَلِيم، لاَ الَهَ الاَّ اللهُ رَبُّ العَرْشِ العَظِيمِ ، لاَ الَهَ الاَّ اللهُ رَبُّ السَمَوات وَرَبُّ العَرْشِ الكَرِيم))[٦].

واتە: (ابن عباس) . ڕەزای خوای لێبێت ــ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەکاتی بەلاّو نەهامەتیدا دەیفەرموو: ((پەروەردگار تاک و تەنیاو مەزن و بەسۆزو بەزەییەو، هیچ پەروەردگارێك نی یە جگە لە پەروەردگاری عەرشی مەزن کەخوای ئاسمانەکان زەوی و کۆشکی شکۆمەندو ڕێزدارە)).

٦ ـ وَعَنْ أنَسٍ (ﷺ) أنَّ النَّبيَّ (ﷺ) كَانَ اذَا حَزِبَهُ أمْرٌ قَالَ: (( يَاحيُّ يَا قَيّوم بِرَحْمَتِكَ أسْتَغِيْثُ ))[٧].

---

[٦] رواه البخاري ومسلم.

واتە: (انس) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەرکات نەهامەتیـــەك ڕووی بکردایەتـــە پێغەمبـــەری خـــوا(ﷺ) دەیفەرموو: ((ئەی پـەروەردگاری زینـدوو بـێ باك لەبەندەو، ڕێکخـەری سـەرجەم کارەکـان هانـا بـۆ تـۆ دەهێنـمو پـەنات پێدەگرم)).

٧ ـ وَعَنْ ابي بَكْرَةٍ (ﷺ) انَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (دَعَواتُ المَكْرُوب : [اللهمَّ رَحْمَتَكَ ارْجُو فَلاَ تَكلْنِي الَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ وَاصْلِحْ لِي شَأنِي كُلَّهُ ، لاَ الَهُ الاّ انْتَ]))[٨].

واتە: (ابی بکرە) ـ رەزای خـوای لێبێـت ـ لەپێغەمبـەری خـواوە دەگێڕێتـەوە ؛ دەفـەرموێت: ((نـزاو دوعـای کەسـێك بەلاّو نەهامەتی بەسـەر هاتبێت ئەوەیە بڵێت: پـەروەردگارا؛ خوازیـاری سـۆزو میـهرەبانی تـۆمو بـۆ تـەنیا سـاتێکیش مەمسپێرە بەنەفسـی خـۆمو هـەموو کاروبارەکـانم بـۆ چـاكو باش بکەو ، هیچ پەروەردگارێکیش نـییە لەتۆ زیاتر)).

٨ ـ عَنْ سَعْد بنْ ابـيِ وَقَاصٍ (ﷺ) قَالَ: رَسُولَ الله (ﷺ) : ((دَعْوَةُ ذي النُون اذْ دَعَا وَهُو فِي بَطْنِ الحُوت [لاَ الَهَ الاّ انْتَ ، سُبْحَانَكَ انِّي كُنْتُ مِنَ الظَالمِين] لَمْ يَدعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِي شَئٍ قطٌ الا اِسْتُجِيبَ لَهُ)) وَفِي رِوَايَـةٍ : انِّـي لأعْلَـمُ كَلِمَـةً لاَ

---

[٧] رواه الترمذي وقال الحاكم هذا حديث صحيح الاسْناد.

[٨] سنن ابي داود.

يَقُولُهَا مَكْرُوبٌ الاَّ فَرَجَ اللهُ عَنْهُ، كَلِمَةُ اخِي يُونُسَ عَلَيْهِ السَلاَم))[٩].

واتە: (سعد)ی كوڕی (ابی وقاص) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((نزاو دوعاكەی (ذي النون) لەسكی نەهەنگەكەدا ئەمەبوو: [هیچ پەروەردگارێك نی‌یە لەتۆ زیاترو ، بێگەردی‌و پاكی بۆ تۆیەو بەڕاستی من لەستەمكاران بووم] هەر موسوڵمانێك ئەم دوعاو نزایە بكات‌و بەگەڕی بخات لەپێداویستی خۆی‌دا بێگومان نزاو دوعاكەی گیرایە)).

لە (ڕوایە)تێكی دیكەشدا دەفەرموێت: ((نزایەك دەزانم گەر كۆستكەوتوو بەلأدار بیكات دەروی لێدەكرێتەوە، ئەویش نزاكەی (یونس)ی برامە (سەلامی خوای لێبێت)).

٩ ـ عَنْ عَبْدُالله بن مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (( مَا أصَابَ أحَداً قَطُ هَمٌ وَلاَ حَزَنٌ فقَالَ: اللهُمَّ انِي عَبْدُكَ وَابنُ عَبْدِكَ وَانِ أمَتِكَ ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ ، مَاضٍ فِي حُكمِكَ عَدلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ ، اسْأَلُكَ بِكُلِ اسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَيْتَ بِهِ نَفْسَكَ ، أوْ انْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ أوْ عَلَّمْتَهُ أحَداً مِنْ خَلْقِكَ ، أوْ اسْتَأثَرْتَ بِهِ فِي عَالَمِ الغَيْبِ عِنْدَكَ أنْ تَجْعَلَ القرانَ رَبِيعَ قَلْبِي وَنُورَ صَدْرِي ، وَجَلاَءَ حُزْنِي وَذَهَابَ هَمِي، الاَّ اذْهَبَ اللهُ عَزَوَجلَ هَمَهُ ، وَأبْدَلَهُ مَكَانَ

[٩] رواه الترمذي.

حُزْنه فَرَحاً قَالُوا: يَا رَسُولَ الله يَنْبَغِي لَنَا أنْ نَتَعَلَّمَ هَؤُلاءِ الكَلِمَاتِ قَالَ: أجَل يَنْبَغِي لِمَنْ سَمِعَهُنَّ أنْ يَتَعَلَّمَهُنَّ))[10].

واتە: (عبدالله)ی کوڕی (مسعود) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی غەمو پەژارە ڕووی تێکرد بڵێت: [پەروەردگارا! من بەندەو وەچەی دووبەندەی تۆم ، سەراپای ژینم بەدەستی تۆیەو فەرمانداری تۆمو هەموو چارەو قەزاکانی تۆ داد پەروەری‌یە بۆم ، دەپاڕێمەوە بەسەرجەم ناوە جوانەکانی لەخۆت ناوە یان لەتێنووسی مەزندا ئاماژەت پێداوەو فێری یەکێك لە بەندەکانت کردووە، یاخود لەجیهانی پەنهان‌و غەیبدا هەڵت گرتووە لای خۆت ؛ قورئانی مەزن بگێڕە بەنورو ڕووناکی سینەمو ڕەوێنەری غەمو پەژارەکانم]، هەرکات بەندە ئەم نزایەی کرد غەمو پەژارەکانی دەڕەوێتەوەو سرودو شادیی لەجێی دێتە ئاراوە، یارانیش فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێویستە فێری ئەم نزاو دوعایە ببین ؟ فەرمووی: بەڵێ ؛ دەبێت ئەوەی ئەم نزایە دەبیستێت فێری ببێت‌و بیڵێت)).

[10] رواه أحمد وأبويعلى والطبراني.

## دوعای ئاسانکردنی کاری قورس و گران

١٠ ـ عَنْ انَس ، انَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: ((اللهُمَّ لاَ سَهْلاً الاَّ مَا جَعَلْتَهُ سهْلاً ، وَانْتَ تَجْعَلُ الحَزَنَ سَهْلاً))[11].

واتە: (انس) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((پەروەردگارا ؛ کاری ئاسان و سانا نییە مەگەر تۆ ئاسان و سووکت کردبێت و، هەر تۆش کاری قورس و گران ئاسان دەکەیت)).

## دوعای ڕووداوێك پێچەوانەی ویستی تۆ بێت

١١ـ اذا وَقعَ لَهُ مَا لاَ يَخْتَارهُ فَلْيَقُلْ: (قَدَرَ اللهُ وَمَا شَاءَ فَعَلَ) وَلا يَقُولُ لَو فَانَّ لَوْ تَفْتَحُ بابَ الشَيْطان))[12].

واتە: ئەگەر ڕووداوو حاڵێك بەچەشنێ کەوتەوە پێچەوانەی خواست و ئارەزووی مرۆڤ بوو بابڵێ: ((ویستی خوایە و هەرچی بوێت دەیکات) با هەرگیز نەڵێت: بریا یان ئەگەر ؛ چونکە وتنی بریاو ئەگەر دەروازە بۆ شەیتان والاّ دەکات)).

---

[11] رواه ابنُ السُنيّ وابنُ حبان.

[12] رواه النسائي من حديث أبي هريرة.

## دوعای شکستو سەرنەکەوتن

١٢ ـ انْ غَلَبَهُ امْرٌ فَلْيَقُل: ((حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الوَكيل))[١٣].
واتە: ئەگەر بارگرانی زۆری بۆ هێناو ئەرکێکی قورس کەوتە ئەستۆی بڵێ: ((پەروەردگارمان هەیەو بەتەنیا ئەو باشترین هاودەمو هاوەڵە)).

## دوعای بەلآو دەردەسەریو نوشوستی

١٣ ـ قَالَتْ أمُ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا): سَمِعْتُ رَسُولَ الله(ﷺ) يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ تُصيبُهُ مُصيبَةٌ فَيَقُولُ: انَّا لله وَانَّا اليه رَاجِعُون ، اللهُمَّ اجرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَاخلُفْ لِيَ خَيْراً مِنْهَا ) قَالَتْ فَلَمَا تُوفيَّ أبُو سَلَمَةَ قُلْتُ كَمَا أمَرَنِي رَسُول الله(ﷺ) فَاخْلَفَ اللهُ لِيَ خَيْراً مِنْهُ رَسُولُ الله (ﷺ)))[١٤].
واتە: (ام سلمە) . رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: گوێبیستی پێغەمبەری خوابووم(ﷺ) دەیفەرموو: ((هەربەندەیەك بەلآو نەهامەتی رووی تێکرد بابڵێ: هەموو هەر بەشی خواینو بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە ، پەروەردگارا؛ لەم بەلآو نوشوستیە قوتارم بکەو قەرەبووی

---

[١٣] رواه أبوداود من حديث عوف بن مالك.
[١٤] اخرجه مسلم.

باشترم بۆ بکەرەوە، ئەوجا پەروەردگار لەو بەلاّو نوشوستیە بەدەری دەکاتو بەپشکی باشتر جێگەی بۆ پڕدەکاتەوە))
ئنجا (ام سلمه) دەفەرموێت: کاتێك (ابو سلمه) وەفاتی کرد ئەم دوعاو نزایەم کرد بەوچەشنەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردبوومو پەروەردگاریش خێرانداری کردم بەپێغەمبەری خوا(ﷺ)).

١٤ـ عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): ((يَسْتَرْجِعُ احَدُكُمْ فِي كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى فِي شَسَعِ نَعْلِه فَأنَّهَا مِنَ المَصَائِبِ))[15]. سْتَرْجَعُ: يَقُولُ اذا نَزَلَ بِهِ مَا يَسُوءهُ حَتَّى وَلَو انْقَطَعَ الشَسع: (انَّا للَه وَانَا الَيهِ راجعُونَ).

وَالشَسَعُ : (أحد سيُور النَعلِ التي تُشَدُّ الَى زِمَامِهَا).

واتە: (ابی هُرَیرة) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هانا بەرن بۆ پەروەردگار لەسەرجەم بەلاّو نەهامەتیەکدا دێت بەسەرتاندا تەنانەت لەبچڕاندنی لاکی نەعلەکانیشتاندا کاتێ واتان بەسەرهات بڵێن: هەموو هەربەشی خواینو بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە)).

---

[15] رواه ابن السُني.

# نزاو دوعای کاتی تورەبوون

١٥ ـ عَنْ سُلَيْمَان بنُ صَرد قَالَ: كُنْتُ جَالسَاً مَعَ النَّـبيِّ (ﷺ) وَرَجُلاَنِ يَسْتَبَّانِ: أحَدُهُمَا قَد احْمَـرَ وَجْهُـهُ وَ انْتَفَخَـتْ أودَاجُهُ فَقَالَ النَّبيُّ (ﷺ): ((انِّي لأعْلَمُ كَلمَةً لَوقَالَها ذَهَـبَ عَنْـهُ مَـا يَجِـد لَـوْ قَـالَ: أعُـوذُ بِـالله مِـنَ الشَّـيْطانِ الرَّجِيـمِ ذَهَـبَ عَنْهُ))[١٦].

واتە: (سليمان) ی کوڕی (صرد) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: لەخزمەت پێغەمبەردابووم (ﷺ) دووپیاو دەمیان لەیەك گیراو دەستیان کرد بەقسەی ناشیرین بەرامبەر بەیەك‌و یەکێکیان ڕووخساری سـوور هەڵگـەڕابوو و دەمارەکـانی لا ملی هەڵسابوون، پێغەمبـەری خـواش(ﷺ) فەرمووی: نزایەك دەزانم گـەر بیڵێـت ئـەو حاڵـەی تێیکـەوتووە دەڕەوێتـەوە، گەربڵێ: پەنا دەگرم بەخوا لەشەیتانی نەفرین لێکراووخەشم لێگیراو، ئەوا تورەییەکەی دەڕەوێتەوە)).

---

[١٦] رواه البخاري ومسلم.

## دوعای گرانی بژێوی‌و باری ژیان

١٦ـ عَنْ ابن عُمَر (رضي الله عنه)عَنِ النبيِّ (ﷺ) : (مَا يَمْنَعُ أحَدُكُمْ اذا عَسَرَ عَلَيهِ امرَ مَعِيشَتِه انْ يَقُولَ اذا خَرَجَ مِنْ بَيْتِه (بِسْمِ الله عَلَى نَفْسِي وَمَالِي وَدِينِي ، اللهُمَّ رَضِنِيٍّ بِقَضائِكَ ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا قَدَر حَتَّى لاَ احبُّ تَعْجِيلَ مَا اخَّرْتُ وَلاَ تَاخِيرَ مَا عَجَلْتُ))[17].

واتە: (ابن عمر) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: گەر یەکێکتان تووشی گرانی بژێوی‌و باری ژیان هات با کاتێ لەماڵ بەدەرکەوت بڵێ: ناوی خوا دەهێنم بەسەر خۆم‌و ماڵ‌و دینمدا ، پەروەردگارا؛ رازیم بکە بەچارەنووسی خۆت‌و ، فەرو خێریش بخە نێو ئەوبەشەی بۆت داناوم هەتا دڵم کەمەندکێش نەبێت بەلای ئەوبەشەی لەدواییدا دێت یان پێشدەکەوێت)).

---

[17] رواه ابن السني.

## دوعای پەیدابوونی گومان و دوودڵی

١٧ـ قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ [(فصلت:٣٦)].
واتە: ((ئەی ئیماندار ، ئەگەر لەلایەن شەیتانەوەو خەیاڵی نادروست لەدڵ و دەروونتدا دروست بوو، ئەوە تۆ داوای یارمەتی لەخوا بکەو پەنای پێ بگرە، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەرو زانایە))[١٨].
وَعَنْ أبِي هُرَيرَةَ (ﷺ) قَالَ: رَسُولُ الله (ﷺ) : ((يَأْتِي الشَّيطَانُ أحَدَكُمْ فَيَقُولَ مَنْ خَلَقَ كَذَا؟ مَنْ خَلَقَ كَذَا؟ حَتَّى يَقُولَ: مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فَاذَا بَلَغَ ذَلِكَ فَلْيَسْتَعِذ بِاللهِ وَلْيَنْتَهِ))[١٩].
واتە: (ابی هریرە) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ، دەفەرموێت: ((شەیتان گومانی خراپ دەباتە نێو دڵتان و سەرەتا لەپرسیارکردن سەبارەت بەدروستکراوەکانەوە دەست پێدەکات و تاوتاو پرسیار دەوروژێنێ و هەتا دەگاتە ئەو ئاستەی بڵێت کێ پەروەردگاری دروستکردووە؟!! کاتێ گەیشتە ئەو ڕادەیە با پەنا بەخوا بگرێ و دوایی پێ بهێنێت)).

---

[١٨] تەفسیری ئاسان : ٤٨٠.
[١٩] رواه البخاري ومسلم.

١٨ ـ وَفِي الصَحِيح: أنَّهُ (ﷺ) قَالَ: ((لاَيَزَالُ النَّاسُ يَتَسأءَلُونَ حَتَّى يُقَالَ: خَلَقَ اللهُ الخَلْقَ فَمَنْ خَلَقَ اللهَ؟ فَمَنْ وَجَدَ ذَلِكَ شَيئاً فَلْيَقُلِ: (امَنْتُ بِاللهِ وَرُسُلِهِ).

واتـه: لـه(صحيـح)دا هـاتووه پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموويەتی: ((بەردەوام خەڵكی پرسیاردەكەن هەتا شەیتان ناخی مرۆڤ دوروژێنیو هانی دەداتو دەڵێ: پـەروەردگار دروستكراوەكانی هێناوەتـه بـوون ئـەی كـێ ئـەوی دروستكردووه؟!! هـەركات یـەكێكتان تووشـی قـەیرانێكی لەوچەشنه بوو بابڵێت: ((بڕوادارم بەخواو پێغەمبەر(ﷺ))).

## لەكاتی گەیشتن بەدوژمن و دەستەلأتداراندا

١٩ ـ عَنْ أبِي مُوسى الأشْعَرِيِّ (ﷺ): أنَّ النَبِيَّ (ﷺ) كَانَ اذَا خَافَ قَوْمَاً قَالَ: ((اللهُمَّ انَّا نَجْعَلُكَ فِي نُحورِهِم ونَعُوذُبِكَ مِنْ شُرُورِهِم))[٢٠].

واتـه: (ابی موسی) ی (اشعری) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕێتـەوه ؛ دەفـەرموێت: هـەركات پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەگرۆو كۆمەڵێك بترسایه دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ ئێمە تۆ ڕووبـەڕوویان دەكەینـەوەو پەناشـت پێدەگریـن لەشـەڕو خراپەیان)).

[٢٠] اخرجه ابوداود والنسائي. وقال الالباني: صحيح الاسناد وصححه الحاكم ووافقه الذهبي.

٢٠ ـ عَنْ انَس (ﷺ) عَنِ النَبيِّ (ﷺ) انَّهُ كَانَ يَقُولُ عنْدَ لقاءِ العَدوِ : ((اللهُمَّ انتَ عَضدِي وَانْتَ نَصيرِي ، بِكَ أجولُ ، وَبِكَ أصُولُ ، وَبِكَ أقاتِل))[21].

واته: (انس) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەركات پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـەدوژمن بگەیشـتایە دەیفـەرموو: ((پـەروەردگارا؛ تـۆ هـێزو توانـاو پـەناو پشـتگیری منـی ، بەناوی تۆ لەمەیدانی جەنگ هەڵدەسوڕێمو دەجەنگم)).

٢١ ـ قَالَ عَبْدُالله بنُ عَبَاس (ﷺ): ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الوَكيل﴾ قَالَهُ ابْرَاهيم حيْنَ أُلْقِيَ فِي النَّار وَقَالَهُ مُحَمَدٌ حِينَ قَالَ لَهُ النَّاسُ:﴿انَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ﴾[22][(ال عمران: ١٧٣)]).

واته: (عبدالله)ی كوڕی (عباس) ـ رەزای خوایان لێبێت ـ دەفەرموێت: دەسـتەواژەی: ((خوامـان بەسـە كـەیاریدەدەرو یارمەتیدەرێكی چاكە)) (ابراهیم) ـ پێغەمبـەری خـوا گوتـی كاتێ هەڵدرایە نێو ئـاگرو (محمـد)یش (ﷺ) گوتـی: كـاتێ هەواڵی گەلەكۆمەكەی خەڵكیان پێ‌ڕاگەیاند)).

---

[21] رواه أبوداود بسند صحيح.

[22] رواه البخاري.

## نزاو دوعای دیمەنە بەرچاوو دیارەکان ئەگەر دیمەنێکی بینی شادیی‌و ئاسوودەیی هێنـا بەبەردا :

٢٢ـ قَالَ اللهُ تَعَالَى:﴿وَلَوْلا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاءَ اللَّـهُ لا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ﴾ [(الكهف: ٣٩)]

واتـە: ((دەبوا کـاتێك چوویتـە نـاو باخەکەتـەوە بتوتایـە: (اشـاء الله) هـەرچی خواویستی لەسـەربێت هەرئـەوە پێـش دێت ، هیچ هێزو توانایەك بۆ هیچ کەس نی‌یە تەنها بەهۆی خواوە نەبێت))[٢٣].

ـ وَعَنْ أنسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) : ((مَا أنْعَمَ اللهُ عَلَى عَبْدٍ نِعْمَةً فِي أهلٍ أو مَالٍ وَوَلَدٍ قَالَ : (مَاشَاءَ اللهُ لاَقُوَّةَ الاَّ بِالله) فَيَرَى فِيهَا افَةً دُونَ الموْتِ))[٢٤].

واتە: (انس) . رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتـەوە؛ دەفـەرموێت: ((ئەگـەر پـەروەردگار نـازو نیعمـەتی خـاووخێزان‌و مـاڵ‌و سـامان‌و وەچـەی بەخشـی بەبەندەیەکی‌و نزاو دوعایکرد وتـی: هـەرچی خـوا ویسـتی لەسەربێت هەر ئەوە پێش دێت هیچ هێزو توانایەك بۆ هیچ

---

[٢٣] تەفسیری ئاسان: ٢٩٨.

[٢٤] رواه ابن السني.

کەس نی‌یە تەنیا بەهۆی خواوەن نەبێت))ئەوا لەهەموو گرفت‌و نەهامەتیەك دەپارێزرێت جگە لەمردن نەبێت)).

# نزاو دوعای بینینی دیمەنێکی دڵتەزێن

٢٣ ـ عَنْ عَائشَةَ رَضيَ اللهُ عَنهَا عَنْ النَبيِّ (ﷺ) انَّهُ كَانَ اِذَا رای مَايُسِرُهُ قَالَ: ((الحَمْدُ لله الذي بِنعْمَتِه تَتُمُ الصَالحَات)) وَاذَا رأى مَا يَسوءهُ قَالَ: ((الحَمْدُ للهِ عَلَى كُلِّ حالٍ))[٢٥].

واتە: خاتوو (عائشە) ــ رەزای خوای لێبێت ــ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((هەرکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) حاڵ‌و بارێکی دڵڕفێن‌و شاد ئامێزی بەدیبکردایە دەیفەرموو: سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی بەنازو نیعمەتەکانی ئەو چاکەو باشە دێتە ئاراوە ))خۆ ئەگەر حاڵ‌و بارێکی ناخۆش‌و غەمباری بەدی بکردایە دەیفەرموو: ((سوپاس‌و ستایش بۆ پەروەردگار لەسەرجەم حاڵ‌و بارێکدا)).

---

[٢٥] رواه ابن ماجه وقال الحاكم: هذا حديث صحيح الاسناد.

# ئەگەر نۆبەری بەروبوومێکی بدیایە

٢٤ ـ قَالَ ابو هُرَيرَةَ (رضي الله عنه) : كَانَ النَّاسُ اذَا رَاوا أولَ الثَّمَرِ جاؤوا بِهِ الَى رَسُولِ الله (ﷺ) فَاذَا اخَذَهُ رَسُولُ الله (ﷺ) قَالَ: ((اللهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي ثَمَرِنَا ، وَبَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا ، وَبارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا ، وَبَارِكْ لَنَا فِي مُدِّنَا ) ثُمَّ يُعْطِيهِ اصْغَر مَنْ يَحْضُر مِنَ الوِلْدَان))[٢٦].

واتـە: (ابوهريره) ـ رەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت: ((هەرکاتێك خەڵکی نۆبـەرەی بـەروبوومیان پـێ بگەیشـتایە لێیان دەکـردەوەو دەیـان هێنـا بـۆ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)و ئەویش لێی وەردەگرتن‌و دەیفەرموو: ((پـەروەردگارا ؛ فـەڕو بەرەکەت بخە نێو بەروبوممانەوەو شارمان گوشادو فراوان بکەو، کێش‌و شایەنیشمان پترو زیادبکەی)) ئەوجا نۆبەرەی ئەو بەروبوومەی دەدا بەبچووکترین منداڵی دەورروبەری.

---

[٢٦] اخرجه مسلم.

## نزاو دوعای بەدیكردنی خەندەو بزەی شادی لەڕووی برایەكی موسوڵماندا

٢٥ـ اذا رَأى اخَاهُ المُسْلِم يَضْحَكُ قَالَ: ((أضْحَكَ اللهُ سِنَّكَ))[٢٧].

واتە: كاتێ خەندەو بزەی شادی بەڕووی یەكێكدا بەدی بكردایە دەیفەرموو: ((یاخوا خەندەو بزەی شادی ئاوێزانی هەموو تەمەنت بێت)).

## نزاو دوعای بەدیكردنی ئەوانەی گیرۆدەی دەستی بەلاو نەهامەتیەك هاتوون

٢٦ ـ عَنْ ابي هُرَيرَةَ (ﷺ) ؛ عَنِ النَبيِّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ رَأى مُبْتَلي فَقَالَ: [الحَمْدُ لله الذيِّ عَافَاني ممَّا ابتَلاَكَ به وَفَضَلَني عَلَى كَثيرِ ممَّنْ خَلَقَ تَفْضيلا] لَمْ يُصبْهُ ذَلكَ البَلاَءَ))[٢٨].

واتە: (ابی هریرە) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هەركاتێك كەسێكتان بەدیكرد تووشی نەهامەتی و گیروگرفتێ بووبوو بڵێن: ((سوپاس و ستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی منی

---

[٢٧] رواه البخاري ومسلم من حديث سعد بن أبي وقاص.

[٢٨] قال الترمذي حديث حسن.

بەدوورگرتووە لەو ناتـەواوی‌و بـەلاّو گیروگرفتـەی داویـەتی بەسەرشـانی تـۆداو، ریّـزداری کـردووم بەسـەر زۆریّـك لەدروستكراوانی خۆیدا)).

## نزاو دوعای بینینی ڕووی مانگ

٢٧ ـ عَنْ عَبدُالله بن عُمَرِ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) اذا راى الهِلاَلَ قَالَ: ((اللهُ أكبَر ، اللهُمَّ أهلَهُ عَلَيْنَا بِالأمْنِ وَالأيْمَانِ ، والسَلاَمَةِ وَالأسْلاَمِ وَالتَوْفِيقِ لِمَا تُحِبُ وَتَرْضَى ، رَبُنَا وَرَبُكَ اللهُ))[29].

واتـە: (عبدالله)ی كوڕی (عمر) ـ ڕەزای خـوای لیّبیّـت ـ دەفەرمویّت: كاتیّ پیّغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی مانگی بەدی بكردایـە دەیفـەرموو: [(الله اكبر) خوامـەزن‌و گەورەیـە ، پـەروەردگارا ؛ ئـەم مانگـە بـەهیّمنی‌و ئاسـایش‌و بـاوەڕو ئاشتی‌و ئیسلام‌و سەركەوتن لەوكارورەفتارانەی پیّی رازی‌و پەسەندە لات بگیّرە ، ئەی مانگ پەروەردگاری ئیّمەو تۆیش خوای مەزن‌و بالاّیە)].

---

[29] اخرجه الدارمي و الترمذي اخصر منه من حديث طلحة وقال الألباني: حديث صحيح بشواهده وصححه ابن حبان.

# نزاو دوعای هەندێك لەدیاردە سروشتیو گەردوونییەكان

## نزاو دوعای هەڵكردنی گەردەلوول

٢٨ـ قَالَتْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا كَانَ النَّبِيُّ(ﷺ) اذا عَصَفَتْ الرِيحُ قَالَ: ((اللهُمَّ انِّي أسألُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرِ مَافِيهَا وَخَيْرِ مَا ارْسَلْتَ بِهِ ، وَأعُوذُبِكَ مِنْ شَرِهَا وَشَرِ مَا فِيهَا وَشَرِ مَا ارْسَلْتَ بِهِ))[٣٠].

واتە: خاتوو (عائشە)ی دایكی موسوڵمانان ـ رەزای خوای لێبێت . دەفەرموێت: هەركاتێك گەردەلوول و رەشەبا هەڵی بكردایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: ((پەروەردگارا ؛ خوازیاری خێرو چاكە ئامێزی ئەم گەردەلوول و بایەمو ، پەناش دەگرم بەشەڕو ناكامی خراپە ئامێزی)).

---

[٣٠] اخرجه مسلم.

# نزاو دوعای گوێ بیستبوونی چەخماخەو هەورە بروسكە

٢٩ ـ كَانَ عَبْدُالله بنُ الزُّبَير (ﷺ)اذا سَمِعَ الرَعْدَ تَركَ الحَدِيثَ وقَال: ((سُبْحَانَ الذي يُسَبِحُ الرَعْدُ بِحَمْدِهِ والملائكة مِنْ خِيفَتِه))[٣١].

واته: هەركات (عبدالله)ی كوڕی (زبير) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ گوێی لەدەنگی هەورە بروسكەو چەخماخە ببوایە دەیفەرموو: ((بێگەردی‌و پاكی لەو پەروەردگارەبێت هەورەبروسكەو فریشتەكان تەسبیحات‌و سوپاس‌و ستایشی دەكەن)).

ـ وعَنْ عَبْدُالله بن الزُبَير وعَنْ كَعْبٍ انَّهُ قَال: ((مَنْ قَالَ ذَلِكَ ثلاثاً عُوفِيَ مِنْ ذَلِكَ الرَعْدِ))[٣٢]

هەروەها لە(عبدالله)ی كوڕی (زبير)و (كعب)ەوە دەگێڕنەوە؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی سێجار ئەم ویردە

---

[٣١] قال الالباني صحيح الاسناد موقوفاً ، اخرجه مالك (١٥٤/٣) وعنه البخاري في الادب المفرد ، والبيهقي في (السنن الكبرى) : (٣٦٢/٣) بسند صحيح .

[٣٢] رواه الطبراني وقال الحافظ موقوف حسن الاسناد.

دووپات بکاتەوە لەزیان‌و خراپەی هەورە بروسکە بەدوورو پارێزراو دەبێت)).

## نزاو دوعای داکردنی باران

٣٠ ـ اذا رَای المَطَر قَالَ: ((اللهُمَّ طَيِباً نَافِعَاً)) [(مَرَتَينِ او ثلاَثاً)][٣٣].

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەکاتی باران بارینـدا دوو یان سێ جار دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ بیگێڕە بەبارانێکی سوود بەخش‌و فەڕدار)).

## نزاو دوعای زیاد باران بارین‌و ترسان لەزیانەکانی

٣١ـ ((اللهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا ، اللهُمَّ عَلَى الاكَام وَالاجَامِ وَالظَرابِ، وَالأوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَجَر))[٣٤].

٣واتە: ((پەروەردگارا؛ دووری بخەرەوە لێما و بیبارێنە بەسەر تەپۆڵکەو گردو شیوو سەوزایی‌و دارو درەختدا)).

---

[٣٣] رواه أبوشيبة من حديث عائشة رضي الله عنها.

[٣٤] رواه البخاري من حديث أنس.

# نزاو دوعاکانی نەخۆشیو مردن

## نزاو دوعای سەردانی نەخۆش

٣٢ـ اذا عادَ مريضاً قالَ: (([اللهُمَّ اذهب البأسَ ربَّ النَّاسِ اشفِ أنتَ الشافِي ، لاَ شفاءَ الاَّ شفاؤُكَ شفاءً لاَ يُغادرُ منْها سَقَماً] وَيُمْسِحُ بِيَدِهِ عَلَيهِ وَيَطيبُ خَاطرَهُ))[٣٥].

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرکات سەردانی نەخۆشی بکردایە دڵنەوایی‌دەکردو دەستی دەهێنا بەسەر جێگەو شوێنی ئازارەکەیداو دەیفەرموو: ((پەروەردگار بەتەنیا تۆ شیفاو چارەسەر بەخشیو، ئێشو ئازاری برەوێنەرەوەو لەش ساغی پێ ببەخشەو بەچەشنێ جارێکی دی ئازار رووی تێنەکات)).

## نزاو دوعای پرسەو سەرەخۆشی

٣٣ـ وَفِي العَزاء يُسَلِّمُ وَيَقُولُ: ((انَّ لله مَا اخَذَ ولَهُ مَا اعْطَى وكُلُّ شَئٍ عِنْدَهُ بِأجلٍ مُسَمَى فَلْتَصبِرِ ولِتَحْتَسِبِ))[٣٦]

---

[٣٥] رواه البخاري من حديث عائشة.

[٣٦] رواه البخاري من حديث أسامة.

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەکاتی پرسەو سەرەخۆشیدا دەیفەرموو: ((بەتەنیا پەروەردگار خاوەنی بەخشین و بردنەو تەمەن و وادەی هەموو بوونێك دیاریکراوە ، ئارام بگرەو بەنیازی پاداشتی خوایی بە)).

٣٤ ـ وكَتَبَ رَسُول الله (ﷺ) الى مَعَاذٍ يُعْزِيهِ فِي ابْنِه (بِسْمِ الله الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مِنْ رَسُولِ الله(ﷺ) الى مَعَاذ بنِ جَبَلٍ: سَلاَمٌ عَلَيك فَأنِي أحْمَدُ اليكَ الله الذي لاَ الَهَ الاّ هُوَ أمَّا بَعْدُ فَاعْظَمَ الله لكَ الأجْرَ وَألْهَمَك الصبْرَ وَرزَقنَا وَايَاكَ الشُكرَ فَأنَّ أنفُسَنَا وَأموَالَنَا وَأهْلَنَا وَأولاَدَنَا مِنْ مَوَاهِبِ الله عَزَوَجَلَ الهَنِيَةَ وَعَوَارِيهِ المُسْتَودَعَةَ نُمَتِعُ بِهَا الي أجَلٍ مَعْدودٍ وَيَقبِضَهَا مِنْكَ بِأجرٍ كَثِيرِ الصَلاَةَ وَالرَحْمَةَ والهدَى أنْ احْتَسَبْتَ فَاصْبِر وَلاَ يَحبِطْ جَزَعُكَ اجْرَكَ فَتَنْدَم، وَاعْلَم أنَّ الجَزَعَ لاَيَردُ شَيْئًا وَلاَ يَدْفَعُ حُزْنًا ، وَمَا هُوَ نَازِلٌ فَكَانَ قَد ، وَالسَلاَمُ)).

واتە: بەبۆنەی مەرگی جگەرگۆشەیەکی (معاذ)ی کوڕی (جبل)ەوە پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) پرسەنامەیەك دەنووسێ بۆ (معاذ)ی کوڕی (جبل)و تێیدا هاتووە:

لە(محمد)ی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆ (معاذ)ی کوڕی (جبل) ..

سلاوت لێبێت ..

سوپاسگوزاری پەروەردگاری تاك و تەنیات ئاڕاستە دەکەم..

پاشان..

خـــوای گـــەورە پاداشـــتت بداتـــەوەو ئـــارامگرتن‌و سوپاسگوزاری بهێنێت بەبەرماندا، لەڕاستیدا نەفس‌و  ماڵ‌و سامان‌و خاوخێزانمان هـەمووی نـازو نیعمـەت‌و بەخششـی پـەروەردگارن‌و بەئەمانـەت ئەسـپەردەی کـردوون لـەلامان؛ سـابەڵکو تـام‌و چێـژی لێوەربگریـن بـۆ وادەو کـاتێکی دیـاریکراو ، هــەروەها سوپاســگوزاری نــازو نیعمــەت‌و شـوکرانەبژێری هەریـەك لەوانـەی لەسـەرمان بەپێویسـت گێڕاوە.

ئازیزەکەم.. جگەرگۆشـەکەی تـۆش یـەکێك بـوو لـەو نـازو نیعمەتانـەی خـوا پێـی بەخشـی بوویـت‌و بەئەمانـەت ئەسـپەردەی‌کردبوو لـەلات‌و لـەوچانێکی کورتـدا دڵشـادو گوشادی کردی پێی‌و لەساتەوەختێکیشدا بردیـەوە بـۆ لای خۆی‌و ئەجرو پاداشتێکی سۆزو میهرو  سلاَوات ئاسای پـێ بەخشیت ، بۆیە ئارام گربەو با سوێی جەرگ سوتان ئەجرو پاداشتت لەدەست نەدات‌و ئەوسا پەشیمانی بـاڵ بکێشـێ بەسەرتا، گرنگیشە  بزانیت سوێی جەرگ بڕین‌و پەشێوی کۆچکردو ناگێڕێتەوەو غەم‌و پەژارە هەڵناگرێت‌و، ئەو قـەزاو چارەنووسەی دابەزی هەرگیز گەڕانەوەی نی‌یە، لەکۆتاییشدا سلاَوت لێبێت)).

# نزاو دوعا لەکاتی نوێژی مردوودا

٣٥ـ وَفِي صَلاَةِ الجَنَازَةِ يَدْعُوْ لِلْمَيِّتِ بِقَوْلِهِ: ((اللّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ وَاكْرِمْ نُزُلَهُ ، وَوَسِعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالبَرَدِ ، وَنَقِّهِ مِنَ الخَطَايَا كَمَا نَقَّيتَ الثَّوبَ الأَبْيَضَ مِنْ الدَنَسِ ، وَأَبْدِلْهُ دَاراً خَيْراً مِنْ دَارِهِ ، وَأَهلاً خَيْراً مِنْ أَهْلِهِ وَزَوجاً خيراً مِنْ زَوْجِهِ ، وَادْخِلْهُ الجَنَّةَ ، وَاعِذْهُ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ))[٣٧].

واتە: لەکاتی نوێژی مردوودا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزاو دوعای دەکرد بۆ مردوو دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ سۆزومیهرو بەزەییت پێدابێنەوەو لێخۆشبوون بکە بەخەڵاتی و جێوشوێنێکی باشی پێ ببەخشەو دەروازەو دیدی فراوانی لێ والآبکە، خوایە گیان بەئاوو بەفرو تەرزە لەسەرجەم گوناهو تاوانەکانی بیشۆرەوە بەچەشنی پاك بوونەوەی جلوبەرگی سپی لەگەردو خەوش و پیسی ، خوایە گیان لانەو ماڵو خێزانێکی باشتر لەوەی خۆی پێ ببەخشەو لەسزای گۆڕو ئاگری دۆزەخیش پارێزراوو تەریك و بەدووری بگرە)).

---

[٣٧] رواه مسلم من حديث عوف بن مالك.

## نزاو دوعای سەردانی گۆڕستان

٣٦ ـ فِي زِيَارَةِ القُبُورِ يَقُولُ: ((السَلاَمُ عَلَيكُمْ أهْلَ الدِّيَارِ ، مِنَ المُؤمِنِيـنَ والمسْلمِينَ ، وَيَرْحَـمِ اللهُ المسْتَقْدمِينِ مِنْكُـمْ وَالمسْتأخِرِينِ ، وَانَّا انْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ ، اسْألُ اللهَ لَنَا وَلَكُمْ العَافِيَةَ انْتُمْ لَنَا فُرط ، وَنَحْنُ لَكُمْ تَبَعٌ ، اللهُمَّ لاَ تُحرِمْنَا اجْرَهُمْ وَلاَتَضِلَنَا بَعْدَهُم))[٣٨].

واتـه: لـەكاتی سـەردانی گۆڕستاندا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەیفـەرموو: ((سـەلامی پـەروەردگارتان لەسـەر بێـت ئـەی باوەڕدارو موسوڵمانانی گۆڕستان نشین ، خوا لـەکۆچکردی نـویۆ دوایینتـان ببـوریۆ پشـت بـەخوا ئێمـەش دەگـەین بەکاروانی ئێوە ، داواکاریشین پەروەردگار بێوەیی بـەئێوەی پێشـەنگو ئێمـەی شـوێنکەوتوو ببەخشـێ، پـەروەردگارا؛ لەپاداشتی ئەوان بێبەشمان مەکەو لەدوای ئەوانیش وێڵـیو سەرگەردانی مەهێنە ڕێمان)).

٣٧ ـ وَقَالَ بُرَيْدَةَ (ﷺ) : كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُعَلِمَهُمْ اذَا خَرَجُوا الَى المقَابِرِ أنْ يقُـولَ قَائِلَـهُم: ((السَّلاَمُ عَلَيْكَم اهْلَ

---

[٣٨] رواه مسلم والنسائي وابن ماجه وابن السني.

الدِّيَارِ مِنَ المُؤمِنِينَ وَالمُسلمِينَ وَانَا اِنْشَاءَ اللهُ بِكُمْ لاَ حِقُونَ نَسْأَلُ اللهَ لنَا ولَكم العَافِيةَ))[39].

واتە: (بريدە) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فێری کردین کاتێ چووین بۆ گۆڕستان بڵێین: ((سڵاوتان لێبێت باوەڕدارو موسوڵمانانی گۆڕستان نشین ، پشت بەخوا دەگەین بەڕەوگەی ئێوەو خوازیاری بێوەیی‌و لێخۆشبوونی پەروەردگارین بۆ هەردوولامان)).

## نزاو دوعای جیاواز و فرە مەبەست

## دوعای پیرۆزبایی لەهاوسەرگیران

٣٨ ـ عَنْ ابِي هرَيْرَةَ (ﷺ) انَّ النَبِيَّ (ﷺ) كَانَ اذَا رَفَّأَ الأنْسَانُ ، اذَا تَزَوَّجَ قَالَ: (بَارَكَ اللهُ وَبَارَكَ عَلَيْكَ ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ))[40].

واتە: (ابی هریرە) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: هەرکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) پیرۆزبایی پێشکەش بەتازە هاوسەران بکردایە دەیفەرموو: ((یاخوا

---

[39] اخرجه مسلم.

[40] رواه البخاري ومسلم.

هاوسـەرگیریتان پـیرۆزبێت و لەسـەر خـێرانداری یـەکانگیر بووبن)).

## دوعاکردن لەکاتی پژمیندا

٣٩ ـ قَالَ أَبُوهُرَيرَةَ (ﷺ) عَنِ النَبيِّ (ﷺ) قَالَ: ((اذا عَطَسَ احَدُكُمْ [فَلْيَقُلِ الحَمْدُ للهِ] ، وَلِيَقُل لَـهُ اخُوهُ او صَاحِبَـهُ [يَرْحَمُكَ اللهُ]، فَلْيَقُل: [يَهْدِيكُمُ اللهُ وَيُصْلِحِ بَالَكُم]))[٤١].

واتـە: (ابوهریـرە) ـ رەزای خـوای لێبێـت ـ لەپێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) دەگێڕێتـەوە ؛ دەفـەرموێت: ((هـەر کەسێکتان پژمـی بڵێـت سـوپاس و سـتایش بـۆ پـەروەردگار، بەرامبەرەکەشـی یـان کەسـانی دەوروپشـتی پێـی بڵێـن: خوالێت ببورێـت ، پاشـان خـۆی نزایـان بـۆ بکـات و بڵێـت: پەروەردگار ڕێنوێن و سینە ساف و شادتان بکات)).

## نزاو دوعای میوان لەدوای نا نخواردن بۆ خاوەن ماڵ ( خانەخوێ )

٤٠ـ عَنْ انَسٍ (ﷺ) أنَّ النَّبيَ (ﷺ) جاءَ الَى سَعْد بنُ عَبَادَةَ (ﷺ) ، فَجَاءَ بِخُبْزٍ وزَيْتٍ فَأكَلَ ثُمَّ قَالَ النَـبيُّ (ﷺ) : (افْطَرَ

---

[٤١] اخرجه البخاري.

عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ ، وَأكَلَ طَعَامَكُمُ الأبْرَار وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ المَلاَئِكَةُ))[٤٢].

واتە: (انس) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەمیوانی چوو بۆماڵی (سعد)ی کوڕی (عباد) - رەزای خوای لێبێت - و نان و ڕۆنی خواردوو پاشان نزاو دوعای بۆکردن و فەرمووی: ((یاخوا هەمیشە ڕۆژوانان لەماڵی ئێوە بەربانگ بکەن و ، پیاوچاکان خواردنتان بخۆن و فریشتەکانیش نزاو دوعای خێرانداریتان بۆ بکەن)).

## نزاودوعا لەکۆتایی کۆڕو دانیشتندا

٤١ ـ عَنْ ابن عُمَر (ﷺ) قَالَ: قَلَمَا كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَقُومُ مِنْ مَجْلسٍ حَتَّى يَدْعُو بِهَؤُلاء الكَلمَات لأَصْحَابه: ((اللهُمَّ أقسم لَنَا مِنْ خَشْيَتكَ مَا تَحُول بِه بَيْنَنَا وَبَيْنَ مَعْصيَتك ، وَمِنْ طَاعَتَكَ مَاتُبَلِّغُنَا بِه جَنَّتَك، وَمنَ اليَقِينِ مَا تَهُونُ بِه عَلَيْنَا مَصَائِبَ الدُنْيَا ، وَمَتِّعنَا بِأَسْمَاعنَا وَأَبْصَارِنَا ، وَقوتَنَا مَا أَحْيَيْتَنَا وَاجْعَلِ الوَرِثَ مِنَّا ، وَاجْعَلْ ثَأْرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ عَادَانَا ، وَلاَ تَجْعَل مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا وَلاَ

[٤٢] اخرجه أبوداود وغيره وقال الالباني هو صحيح.

تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا ، وَلاَ مَبْلَغَ عِلْمِنَا وَلاَ تُسَلِطْ عَلَيْنَا مَنْ لاَيَرْحَمُنَا ))[٤٣].

واتە: (ابن عمر) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: کەمجار پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەکۆڕو دانیشتن هەڵبسایەو بەم نزایە دوعای بۆ هاوەڵانی نەکردایە: ((پەروەردگارا! پشك و بەشێك لەترس و هەیبەتی خۆت بخە نێو دڵمان هەتا رێگرو بەربەست بێت لەنێوان ئێمەو تاواندا، خوایە گیان گوێڕایەڵمان بکە هەتا بگەین بەبەهەشت و ، یەقین و دڵنیاشمان وەبەربهێنە سابەڵکو بەلاّو مەرگەساتەکانی دنیامان لەلا سووك و ئاسان ببێت..خوایە گیان ئاهونزولەی ستەملێکراویمان بخە لەستەمکاران و سەرکەوتوومان بکە بەسەر دوژمن و نەیارانمان..خوایە گیان هەرگیز دنیا نەکەیت بەپێشەکی هەوڵ و کۆششمان و زانیاریمان لەو مەوداو بوارەدا قۆرخ نەکەیت و، کەسانی بێبەزەیی و بێسۆز زاڵ و بالاّ دەست نەکەیت بەسەرماندا)).

---

[٤٣] رواه الترمذي وحسنه والحاكم.

# نزاو دوعای پەناگرتن بەخوا لەڕەفتارو کرداری خراپو ناپەسەند

٤٢ـ عَنْ عَم زِيَادُ بنُ عَلاَقَـةَ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِ (ﷺ) : ((اللهُمَّ انِّي اعُوذُبِكَ مِنْ مُنْكَرَاتِ الأَخْلاَقِ وَالأعْمَالِ وَالأهْوَاءِ وَالأدوَاءِ))[٤٤].

واتە: مامی (زیاد)ی کوڕی (علاقە) رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) دەگێڕێتـەوە ؛ دەفـەرموێت: ((پـەروەردگارا؛ پـەنات پێدەگرم لەخراپـەی رەفتـارو کـردەی ناشیرینو ئارەزوو و چارەسەری نابارو شیاو)).

# دوعای لەدەستدانو ونکردنی شتێك

٤٣ ـ عَنْ ابـن عُمَـرِ عَنِ النـبيِّ (ﷺ) اَنـَهُ كَـانَ يَقُـولُ فـِي الضَالَة: ((اللهُمَّ رَاد الضَالَة وَهَادِي الضَالَة تَهْدِي مِنَ الضَلاَلَة اُرْدُدْ عَلَـيَّ ضَـالَتِي بِقُدرَتِـكَ وَسُلطَانِكَ ، فَانـَّـهَا مِـنْ عَطَـائِكَ وَفَضْلِكَ))[٤٥].

واتە: (ابن عمـر) ـ رەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت: لەکاتی ونکـردنو بزرکردنـی شـتێکدا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)

---

[٤٤] رواه الترمذي والطبراني والحاكم.

[٤٥] رواه الطبراني.

دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ تۆی وێڵ و وگومڕا ڕێنموییی دەکەیت و ونبوو بزرکردوم بگەڕێنەوە، بێگومان ئەوەی ونم کردووە بەشێکە لەبەخشش و ڕێزی تۆ بۆم)).

## دوعای قەرزدانەوە

٤٤ـ عَنْ أنس بن مَالك قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) لمَعَاذ: ((الا أُعلمُكَ دُعَاء تَدْعُو بِهِ لَوْ كَانَ عَلَيْكَ مثْل جَبَل احدٍ دَيْنَاً لأدَى اللهُ عَنْكَ؟ قُلْ يَا مَعَاذ: اللهُمَّ مَالك المُلك تُؤْتِي المُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ المُلْكَ ممَّن تَشَاءُ، وَتُعزُ مَنْ تَشَاءُ، وَتُذلُ مَنْ تَشَاءُ، بِيَدكَ الخَيْرُ انَّكَ عَلَى كُلِّ شَئٍ قَدِير، رَحْمَان الدُنيَا وَالاخِرَة تُعْطيهمَا مَنْ تَشَاءُ وَتَمْنَعُ منْهُمَا مَنْ تَشَاءُ ارْحَمْنِي رَحْمَةً تُغْنِينِي بِهَا عَنْ رَحْمَةِ مَنْ سِوَاكَ))[٤٦].

واتە: (انس)ی کوڕی (مالك) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕێتەوە ؛دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی وتم: نزاو دوعایەکت فێردەکەم گەربێتوو بەئەندازەی کێوی (احد) قەرزت لەسەربێت پەروەردگار یارمەتی و کۆمەکیت دەکات لەدانەوەیدا، ئەی (معاذ) بڵێ: پەروەردگارا؛ تۆ خاوەن دەستەڵات و موڵکی بەرفراوانیت و دەبەخشی و دەیگریتەوە لەوەی خۆت دەستنیشانی دەکەیت و ، ڕەزەڵخوایی و

---

[٤٦] رواه الطبراني في الصغير.

ملكەچیش بەدەستی تۆیەو بەویستی خۆت دایدەبەزێنی بۆ ئەوانەی دیاریت كردوون‌و، هەر تۆی خاوەنی سەراپای گەنجینەكانی خێروچاكەیت‌و لەدنیاو قیامەتدا دەیبەخشی‌و دەیگری لەوانەی خۆت دەتەوێت‌و بەزەییت بەحاڵی مندا بێتەوە ، بەوچەشنەی بەتەنیا پێویستم بەسۆزو میهری تۆبێت‌و بێ‌باك بم لەخەڵكی)).

## دوعای یەكێك شەو بەئاگاو بێدار بێتەوە لەخەو

٤٥ ـ عَنْ عَبَادَةَ بنُ الصَامت (ﷺ) عَنِ النَبيِّ (ﷺ) قَالَ: مَنْ تَعَارَّ منَ الليْلِ فَقَالَ: (لاَ الهَ الاَاللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ ـ لَهُ المُلْك وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شئ قَديْر، الحَمْدُ لله ، وَسُبْحَانَ الله ، وَلاَ الهَ الا الله ، وَالله أكبَر وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَةَ الاَ بِالله) ثُمَّ قَالَ: اللهُمَّ اغْفر لي أوْ دَعَا استجيبَ لَهُ ، فأنَّ تَوضَأ وَصَلَى قَبلَتْ صَلاَتَهُ))[٤٧].

واتە: (عبادە) ی كوڕی (صامت) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: هەركەسێك لەشەودا بەئاگاو بێدار بوو لەخەو بڵێت:

---

[٤٧] اخرجه البخاري.

(پـەروەردگار تاكو تـەنیاو بـیٚ هـاوەڵو هاوتایـەو خـاوەنی موڵــكو دەســـتەڵاتو سوپاســـگوزارییەو باڵادەســـتو توانـاداریی هـەموو رووداوو بوونێکـە، سـوپاسو بێگـەردیو تاكو تەنیاییو گەورەیی هـەر بۆ خوایەو هێزو دەستەڵاتو پەناوپشتگیریش هەر ئەوە) پاشان بڵێ: (پـەروەردگارا؛ لێم ببـورە) یـان نـزا بکـات ئـەوا نزاکـەی گیرایـەو، ئنجـا ئەگـەر دەستنوێژی گـرتو نوێـژی کــرد ئــەوا نوێژەکــەی قبــوڵو پەسەندە)).

## گەر خەوت بینی چی دەکەیت

٤٦ ـ عَنْ ابـي سَعْيدٍ الخُـدْريِّ (ﷺ) انَّـهُ سَمِعَ النَّـبيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((اذَا رَاى احَدُكُمْ رُؤيَاً يُحِبُّهَا ، فَأنَمَا هِيَ مِنَ اللهِ تَعَالَى، فَلْيَحْمَـدِ اللهَ تَعَـالَى عَلَيْهَا ، وَلَيُحَدثْ بِـهَا )) وَفـي رِوَايَـةٍ : (لاَ يُحَدثُ بِهَا الاَّ مَنْ يُحب ، وَاذَا رَاى غَيْرَ ذَلكَ لمَا يُكرِهُ فَأَنَّمَا هِيَ مِنَ الشَّـيْطَان فَلْيَسْتَعِذْ مِـنْ شَـرِهَا وَلاَ يَذْكُرهَـا لأَحَـدٍ فَأنَّـهَا لاتَضُرَّهُ))[٤٨].

واتـە: (ابـی سـعید)ی (خـدری) ـ رەزای خـوای لێبێـت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((خەوی خۆش لەلایەن پەروەردگارەوەیەو، هەرکاتێك خـەوی خۆشو

---

[٤٨] رواه البخاري.

شادی ئامێزتان بینی سوپاس‌و ستایشی خوای لەسەر بکەن‌و بۆ کەسانی دی بگێڕنەوەو دڵنیاش بن زیانتان پێ ناگەیەنێت)).

لە(روایە)تێکی دیکەشدا دەفەرموێت: (( بۆ خۆشەویست‌و ئازیزانی بگێڕنەوەو ، خۆئەگەر خەوی ناخۆش‌و خراپتان بینی ئەوا لەشەیتانەوەیەو هەر بەئاگاهاتن دەسبەجێ پەنا بەخوا بگرن‌و بۆ کەسیشی باس نەکات)).

## دوعاکردن لەکاتی پۆشینی جل‌وبەرگی نوێدا

٤٧ ـ عَنْ أبِي سَعْيِدٍ الخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) اذا اسْتَجَدَّ ثُوبَاً سَمَّاهُ بِاسْمِه . عَمَامَةً او قَمِيْصَاً او رِداءً ـ ثُمَّ يَقُولُ: اللهُمَّ لَكَ الحَمْدُ انْتَ كَسَوتَنِيه ، اسْألُكَ خَيْرَهُ وَخَيْرِ مَا صَنَعَ لَهُ، وَاعُوذُبِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِ مَا صُنِعَ لَهُ ))[٤٩].

واتە: (ابی سعید) ی (خدری) رەزای خوای لێبێت. دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) جل‌وبەرگێکی نوێی بکردایە ناوی دەبرد کراس‌و عەباو مێزەرو ..پاشان دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ سوپاسگوزاری لایەق‌و شایەنی تۆیە لەپۆشتەکردنم بەم پۆشاکە ، خوایە گیان خوازیاری

[٤٩] رواه ابوداود والترمذي وحسنه.

خێرو چاکەو خێرئامێزی دروستکردنی ئەم پۆشاکەم لەتۆو، پەناشت پێدەگرم لەشەڕو خراپەی ئەم پۆشاکەو شەڕی لەخۆگرو دروستکردنی)).

## دوعای موسوڵمان بۆ براکەی کاتێ پۆشاکێکی نوێ دەپۆشێت

٤٨ . رَأى عَلَيهِ الصَلاَة وَالسَلاَم عَلى عُمَر (ﷺ) ثَوباً فَقَالَ: ((الْبِسْ جَدِيْداً وَعِشْ حَمِيداً وَمُتْ شَهِيداً))[٥٠].

واتە: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) (عمر)ی بەپۆشاکێکی نوێوە بینیو پیرۆزبایی لێکردو فەرمووی: ((یاخوا هەمیشە پۆشاکی نوێ بپۆشیتو بەسەر بەرزییەوە بژیتو بەشەهیدی ماڵئاوایی لەدنیا بکەیت)).

## دوعای ڕاچڵەکین لەخەودا

عَنْ عَمرو بن شُعَيبٍ عَنْ أبِيهِ عَنْ جَدهِ أنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ يُعَلِمَهُم مِنَ الفَزَعِ كَلِمَاتٍ: ((أعُوذُ بِكَلِمَاتِ الله التَامَةِ مِنْ غَضَبِهِ وَشَرِ عِبَادِهِ وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَيَاطِينِ وَأنْ يَحْضُرُونِ)).

قَالَ: وَكَانَ عَبْدُالله بن عَمرو يُعَلِمَهُنَّ مَنْ عَقَلَ مِنْ بَنِيهِ، وَمَنْ لَمْ يَعْقِل كَتَبَهُ فَعَلَقَهُ عَلَيهِ)[٥١].

---

[٥٠] رواه ابن ماجه وابن السني.

واتــە: (عمــر)ی کــوڕی (شــعیب) لــەباوكو باپیریــەوە دەگێڕێتــەوە ؛ دەفــەرموێت : پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) لــەکاتی ڕاچڵەکین لەخەودا فێری کردوون بڵێن: ((پەنا بەوتەی پیرۆزو تەواوی پەروەردگار دەگرم لەخەشمو توڕەیــی خۆیو زیانو خراپــەی بــەندەکانیو وەسوەســەو ئامــادەییو دوودڵــی وەبەرنانی شەیتانەکان)).

پاشان دەڵێت: (عبداللە)ی کوڕی (عمر)یش ئەم دوعایەی فــێری منداڵــە ژیــرو پێگەیشــتووەکانی دەکــردو، ئەوانەشــی منداڵ بوونو هێشتا پێنەگەیشتبوون دوعاکەی دەنووسیو دەیکردە ملیان))[51].

## دوعاکردن بۆ کەسێك چاکەت لەگەڵدا بکات

٥٠ ـ عَنْ أُسَامَةَ بنُ زَيدٍ (ﷺ)قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) : ((مَنْ صَنَعَ الَيهِ مَعْرُوف فَقَالَ لِفَاعلِهِ [جَزَاكَ اللهُ خَيْراً]فَقَدْ ابْلَغَ فِي الثَّنَاءِ))[52].

واتــە: (اســامە)ی کــوڕی (زیــد) ـ ڕەزای خــوای لێبێــت ـ لەپێغەمبــەری خــــواوە (ﷺ) دەگێڕێتــــەوە ؛ دەفــــەرموێت: ((هەرکەســێك چاکەیــەکی لەگــەڵدا بکــرێ بــەخاوەن چاکەکــە

---

[51] رواه النووي في سنن ابي داود والترمذي وابن السني وغيرهم.

[52] قال الترمذي حديث حسن صحيح.

بڵـێ: پـەروەردگار بەچاکـە پاداشـتت بداتـەوە، بەمـەش ئەوپەڕی سوپاس و ستایشی نواندوە)).

## سوودێك

١ ـ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَـادْعُوهُ بِهَا﴾ [(الأعراف: ١٨٠)].

واتە: ((هەر بۆ خوایە ناوە جوان و پیرۆزەکان))[٥٣].

(ابی هريره) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ، دەفەرموێت: ((پەروەردگار خاوەن نەوەدو نۆ ناوەو ـ سـەد نـاو یـەکێك کـەم ـ هەرکەسـێك بیانڵێتـەوە بێگومـان دەچێتە بەهەشتەوە ، ناوەکانی هاوچەشنی خـۆی تـاکن و خۆشـی تـاك و تـەنیایی پێخۆشـە))[٥٢]، ناوەکانیشـی بریتین لە:

---

[٥٣] تەفسیری ئاسان: ١٧٤.

[٥٢] هذا حديث رواه البخاري ومسلم الى قوله (يحب الوتر) مابعده حديث حسن ورواه الترمذي.

**الرحمن**
بەخشندەی نازو نیعمەت

**الرَّحیم**
بەخشندەی سەرجەم نازونیعمەتی گەورەو بچووك

**المَلك**
خاوەن فەرمانداریێتی

**القُدُّوس**
بێ کەمو کوڕو ناتەواوی

**السَلاَم**
بەدیهێنەری ئاشتیو بێگەردو خەوش و کەمو کوڕی

**المُؤْمن**
زانا سەبارەت بەهەموو ڕووداوەکان

**المُهَیمن**
خاوەن دەستەلاَت بەسەر هەموو ڕووداوو بەدیهێنراوێك

**العَزیز**
ئەوەی هەرگیز شکستو ئاوابوونو ڕەوینەوە ڕووناکاتە دەستەلاَتی

**الجَبَّار**
خاوەن دەستەلاَتی بێ سنوور

**المُتَکَبِّر**
گەورەی بێ پەرێزو سنوور

**الخَالق**
دامێنەر لەجیهانی نەبوونەوە بۆ جیهانی بوون

**البَاري**
پارێزەری سەرجەم بەدی هێنراوان

**المُصَوِّر**
نەخشەکێشی جوانکار

**الغَفَّار**
داپۆشەری گوناهو تاوان لەدنیاو قیامەتدا

**القَهَّار**
بەجێگەیەنەری ویستو خواستەکان

**الوَهَّاب**
بەخشندەی بێ سنوورو بێ مەرام لەبەخشیندا

**الرزّاق**
رزق و بژێوی دەری سەرجەم بوونەوەر

**الفتّاح**
والآکاری گەنجینەی سۆزو میهر بۆ خەڵکی

**العَليم**
خاوەن زانستی بەرفراوان و گشتگیر

**القابِض**
بگری رزق و بژێوی و هەموو بوارەکانی ژیان

**الباسِط**
بەخشندەو والآکاری رزق و بژێوی

**الخافِض**
دانەوێنەری پلەوپایەی مەردوم و دەستەلآتداران

**الرافِع**
بەرزوبڵندکاری بەندەکان

**المُعز**
بەخشندەی شکۆمەندی رێزدار

**المُذِل**
دابەزێنەری بەندەکان لەبەرزترین پلەو پایەوە

**السَميع**
بیسەری سەرجەم بەدی هێنراوان

**البَصير**
بینەری سەرجەم بەدی هێنراوان

**الحَكَم**
دادوەری سەرجەم بەدی هێنراوان

**العَدل**
دادپەروەری بێستەم

**اللطيف**
بەسۆزو بەزەیی بۆ بەدیهێنراوان

**الخَبير**
پسپۆڕو ئاگاداری هەموو رووداوەکانی بوون

**الحَليم**
نەرمو نیان لەئاست هەموو بەدی هێنراواندا

**العَظِيم**
مەزن و بێهاوتاو شێوە

**الغَفُور**
لێخۆشبووی گوناهو تاوان

**الشَّكُور**
سوپاسکارو باسکەری چاکە

**العَلِي**
بەرزوبڵندی سەرو دروستکراوان (بەتەنیا ئەو پلەیە شایستەی ئەوە)

**الكَبِير**
گەورەی بێسنوورو کۆتا

**الحَفِيظ**
پارێزەری گشت بوونێك لەفەوتان و تیاچوون

**المُغِيث**
پەناو پشتگیرو هانا بەری هەموو بوون

**الحَسِيب**
ئاگاداری گشت رووداوە گەورە بچووکەکان

**الجَلِيل**
دەستەڵاتداری راستەقینە بەسەر بوونەوەردا

**الكَرِيم**
بەخشندە بۆ بەندەکانی پێش داواکردنیان

**الرَّقِيب**
ئاگادارو چاودێری هەموو رووداوو بوونێك

**المُجِيب**
وەڵامدەرەوەی بەندەکان کاتێك هانای بۆ دەبەن

**البَاعِث**
گۆڕەری باری ژیان لەدۆخ و بارێکەوە بۆ یەکێکی دی

**الشَّهِيد**
شاهیدو گەواهی دەر بەسەر هەموو رووداوێکەوە

**الحَق**
خاوەن بوونی جێگیرو نەگۆڕ

**الوَكِيل**
فەراهەم هێنەری سەرجەم ویستەکانی بەندە

**القَويّ**
خاوەن هێزو توانای بێسنوور

**المَتِين**
پتەوو بێهاوتا

**الوَلِي**
سەرپەرشتیاری کاروباری بەندەو بوون

**الحَمِيد**
سوپاسکاری چاکەو باشی بەندەکان

**المُحصِي**
سنوورگرو راگرو ژێری هەموو رووداوێك

**المُبْدِي**
داهێنەری بوونەوەر لەسەرەتاوە

**المُعِيد**
ئاواکارو دوایی هێنەری بوونەوەر بۆ دۆخی پێشوو

**المُحيِ**
بەخشندەی مافی بوون و ژیان

**المُمِيت**
خاوەن و داهێنەری مردن بەسەر بووندا

**الحَيُّ**
هەمیشە نەمرو زیندوو

**القَيُّوم**
رێکخەری کاروباری بەندەکان

**الوَاجِد**
فەراهەمهێنەری سەرجەم بوون

**المَاجِد**
رێزداری بێشومار

**الوَاجِد**
تاك و تەنیا لەخودی خۆی و سەرجەم سیفەت و کردارێکیدا

**الصَمَد**
بێپێویست لەبەندەکانی و جێگەی پێداویستی هەموان

**القَادِر**
توانا و دەستەلاتداری بێسنوور

**المُقْتَدِر**
تواناداری بێسنوور

**المُقَدِم**
پێشخەری رووداوو پێشهاتەکان

**المُؤخِر**
دواخەری گشت رووداوو پێشهاتێك

**الأولَ**
بێوادەی سەرەتا

**الاخر**
بێدوایی و کۆتا

**الظّاهر**
دیارو ئاشکرا لەرێگەی گەردوونەوە

**البَاطن**
ناسێنەری خودی خۆی

**الوَالي**
پادشای بوون و خاوەن گشت مامەڵەیەك

**المُتَعَال**
بەرزو بڵند لەرێزو پلەوپایەدا

**البَر**
خاوەن چاکەی بەرفراوان و بێسنوور

**التّوّاب**
لێخۆشبوو وەرگری تەوبەی بەندەکان

**المُنْتَقم**
تۆڵە لێسێنەری ستەمکاران

**العَفُو**
سڕینەری گوناهو تاوان لەنامەی کردارەکاندا

**الرّؤُوف**
بەسۆزو بەزەیی بۆ بەندەکان

**مَالكَ المُلك**
خاوەن دەسەڵات و پایەداری

**ذُوالجَلاَل والاكرام**
خاوەن ڕێزو شکۆمەندی

**المُقسط**
خاوەن دادو یەکسانی

**الجَامع**
گرێدەری بەشە پەرت و لێکبچڕاوەکان

**الغَنيّ**
دەوڵەمەندی بێسنوورو بێپێویست

**المُغْنيّ**
دەوڵەمەندکاری خەڵکی

**المَانع**
ڕێگرلەو ڕەفتارانەی یاسای گەردوون تێکدەدات

**الضَّار**
زیانگەیەن و نابوتکار

**النَّافع**
سوودمەندو بەهرەوەر

**النُّور**
ڕۆشنکەرو ڕووناکی

| الهَادِي | البَدِيع | البَاقِي | الوَارِث |
|---|---|---|---|
| ڕێنمایی‌کار | داهێنەر | هەمیشـــــە بـــەردەوام‌و بی‌فـــەوتان‌و تیاچوون | مـــــیراتگری هەموو بوون |

| الرشيد | الصَبُور |
|---|---|
| ڕێنمایی‌دەری مەردووم‌و بوونەوەر | ئارامگری بی‌سنوور |

٢ ـ لە(روایە)تێکی (صحیح)داهاتووە: هەرکەسێك لەسەر پـەڕەی دڵ لەبـەری بکـات دەچێتـە بەهەشـتەوە ، سـەبارەت بەژماردنی واتە لەبەر دووپاتی بکاتەوە، هەندێکیش دەڵێن: مەبەسـت پێـی ئەوەیـە ڕۆبچێـت لـەواتاکانی‌داو بی‌گری‌وگـۆ باوەڕی پی‌ بهێنێت.

هەندێکی دیکەش دەڵێن: مەبەست پێی ئەوانەن بەچاکی‌و گونجـاو ڕەچـاوی نـاوەجوان‌و مەزنـەکان دەکـەن‌و ڕەوش‌و ڕەفتاری ڕۆژانەیان لەواتای مەزنی ناوەکانـەوە سـەرچاوەی گرتـــووە)) خـــوای گـــەورەش خـــۆی زانـــاترە بەڕاقـــەی فەرموودەکە.

# بەشی پێنجەم

دوعاکانی نوێژ سەرەتاو دەستپێکردنی نوێژ

دوعاکانی رکوع و کڕنووش

دوعاکانی پاش گەواهیدان ـ شەهادەت ـ

دوعاکانی دوای سەلام دانەوە

چەند دوعایەکی جیاواز

## دوعاكانی نوێژ سەرەتاو دەستپێكردنی نوێژ

١ ـ قَالَ أبُوْ هُرَيْرَةَ (ﷺ) : كَانَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) اذَا اسْتَفْتَحَ الصَلاَةَ سَكَتَ هُنَيهَةً قَبْلَ انْ يَقْرَأ ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ بِأبِي وأمِي أرايْتَ سكُوتَك بَيْنَ التَكْبِيرِ والقِرَاءَةِ مَاتَقُولُ ؟ قَالَ: أقُولُ: [اللهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ المَشْرِقِ وَالمَغْرِبِ ، اللهُمَّ نَقِنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقى الثَوْبَ الأبْيَضَ مِنَ الدَنَسِ، اللهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالثَلْجِ وَالمَاءِ وَالبَرَدِ][1].

واتە: (ابوهريرە) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: كاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەستپێكی نوێژی بكردایە بۆ ساتێكی كەم وچانێكی دەگرت پێش ئەوەی دەست بكات بەخوێندن ، منیش پرسیم: ئەی فرستادەی خوا! دایكو باوكم بەفیدات بێت وچانێكت گرت لەبێدەنگی لەنێوان (الله اكبر)و خوێندنی (فاتحە)دا ئاخۆ چی دەڵێیت لەو نێوانەدا ؟ فەرمووی: دەڵێم: ((پەروەردگارا! گوناهەكانم لێ بەدووربگرە بەچەشنی دووری نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا ، پەروەردگارا ؛ لەتاوانو گوناهەكانم پاكیزەو پوختم بكە بەچەشنی پاكوبێگەردكردنی پۆشاكی سپی لەگەردو خەوشو پیسی،

[1] متفق عليه.

پـەروەردگارا؛ لەگوناهوتاوانـەکانم بــەم شــۆ بەبـەفرو ئـاوو تەرزە)).

٢ . وعَنْ عَائشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا ، وَأبِي سَعيدٍ وغَيْرُهُمَا انَّ النَبيَّ (ﷺ) كَـانَ اذَا افْتَتَـح الصَـلاَةَ قَـالَ: ((سُـبْحَانَكَ اللـهُمَّ وَبِحَمْدِكَ وَتَبَارَكَ إسمُكَ، وَتَعَالَى جَدُك وَلاَ الهَ غَيْرُكَ))[٢].

واته: خاتوو (عائشه)و (ابی سعید) ڕەزای خوایان لێبێت دەفەرمون: کـاتێك پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەسـتپێکی نوێـژی بکردایـە دەیفـەرموو: ((پـــەروەردگارا؛ بێگــەردیو پــاکیو سـتایشو سوپاسـگوزاری هــەر بــۆ تۆیــەو نـاوی جــوانو شکۆمەندی بەرزو بڵند بێت و، هیچ پەروەردگارێکیش نییـە تۆ نەبێت)).

٣ . عَنْ عَلّيُ بنُ ابِي طَالِبٍ (ﷺ) عَنْ رَسُولُ الله (ﷺ) انَّـهُ كَانَ اذَا قَامَ الَى الصَلاَةَ قَـالَ: ((وَجَهتُ وَجـهِيَ للـذِي فَطَـرَ السَمَوات وَالأرض حَنيْفَاً مُسْلمَا ومَا أنا مِنَ المشْـرِكِين، انَّ صَلاَتِي وَنُسُـكِي ومَحْيَـايَّ ومَمَاتِي لله رَبِّ العَالَمِين ، لاَشَرِيك لَهُ وَبِذَلك أمِرْتُ وَانَا مِنَ المسْلِمِين))[٣].

واته: (علی)ی کوڕی (ابي طالب) ـڕەزای خـوای لێبێـت ـ لەپێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) دەگێڕێتـەوە؛ دەفـەرموێت: کـاتێك پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نوێـژی بکردایـە سـەرەتا دەیفـەرموو:

---

[٢] اخرجه الأربعة.

[٣] رواه مسلم.

((پـــەروەردگارا؛ ڕوو ئاڕاســـتەم كـــردە تـــۆی بەدیهێنـــەری ئاسمانەكانو زەویو بەپاكیو موسوڵمانی دەدەم لەقاپیتو من لەوانەنیم هاوەڵ بۆ تۆ پەیدادەكەن، خوایـەگیان نوێـژو قوربانیو ژینو مردنم هەر بۆ تۆی پەروەردگاری جیهانەو بێ هـــاوەڵیتو بـــەم چەشـــنەش گـــەواهی دەدەمو یـــەكێكم لەموسوڵمانان)).

٤ ـ وَقَـالَ عَلِـيُ (ﷺ): كَـانَ رَسُـولُ اللهِ(ﷺ) اذَا قَـامَ الَـى الصَلاَةِ قَالَ: ((وَجَهْتُ وَجْهِيَ لِلَذِي فَطَرَ السَمَوات وَالأرضِ حَنِيْفَاً وَمَا كَانَ مِنَ المُشْرِكِينَ انَّ صَلاَتِـي وَنُسُكِي وَمَحْيَـايَ وَمَمَاتِي للهِ رَبِّ العَالَمِينِ لاَشَرِيكَ لَـهُ وَبِذَلِـكَ أمِـرْتُ وَانَـا مِـنَ المسْلمِينِ ، اللهُمَّ أنْـتَ المَلِك لاَ الَـهَ الاَّ أنْـتَ ، أنْـتَ رَبِـي وَأنَـا عَبْدُكَ ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعتَرِفُ بِذَنْبِي . فَاغْفِرْ لِي ذنُوبِي جَمِيعَاً انَـهُ لاَ يَغْفِـرُ الذنُـوبَ الاَّ أنـتَ ، وَاهْدنِـي لاَحْسَـنِ الأخْـلاَقِ ، لاَيَهْدِي لاَحْسَنِهَا الاَّ أنْتَ ، وَاصْرِف عَنِّي سَيئُهَا لاَ يَصْرِفُ عَنِّي سَيئُهَا الاَّ أنْتَ ، لَبَيكَ وَسَعْدَيكَ ، وَالخَيْرُ كلُهُ فِي يَدَيكَ، وَالشَرُ لَيْسَ الَيكَ أنَا بِكَ وَالَيكَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ ، اسْتَغْفِرُكَ وَأتُوبُ الَيْكَ))[٤].

واتـــە: (علـــی) ـــرەزای خـــوای لێبێـــت ـــ دەفـــەرموێت: هـەركاتێك پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نوێـژی بكردایـە سـەرەتا دەیفـــەرموو: ((پـــەروەردگارا ؛ ڕووئاڕاســـتەم كـــردە تـــۆی

---

[٤] أخرجه مسلم.

بەدیهێنـەری ئاسمانـەكانو زەویو بـەپاكیو موسـوڵمانی دەدەم لەقاپیتو مـن لەوانەنیم هاوەڵت بۆ دادەنێـن ، خوایـە گیان نوێژو قوربانیو ژینو مردنم هەر بۆ تۆی پەروەردگاری جیهانـەو بێهـاوەڵیتو بـەم چەشـنەش گـەواهی دەدەمو یەكێكم لەموسوڵمانان ، پەروەردگارا؛ تـۆی پادشـای تـاكو تەنیایتو خوداوەنـدی منیـتو دان بـەگوناهو تاوانـەكانمدا دەنێمو داواكارم لەسەرجەم تاوانەكانم ببوری چونكە هەر تۆ لێخۆشبووی گوناهو تاوانی، خوایە گیان ڕێنمویـم بكە بـۆ ڕەفتـاری جـوانو شـیرینو تـۆی ڕێنوێنـدەری تـاكو تـەنیاو بەدووریشم بكە لەڕەفتاری ناشیرینو بەتەنیا تۆی تواناداری ئەوە، خوایە گیان گوێڕایەڵیو خۆشنودی بۆ تۆیەو خراپەش نادرێتـە پـاڵ تـۆو منیـش بەپاڵپشـتی تـۆ هـەنگاوەكانم هەڵدەگرمو بۆلای تۆی بەرزو بڵندو خێراندار دەگەڕێمەوە)).

## دوعای پاش ( الله اكبر ) لەشەونوێژدا

٥ ـ عَنْ ابنِ عَبَاسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَقُولُ اذَا قَامَ الَى الصَلاَةِ مِنْ جَوْفِ اللَيْلِ: ((اللهُمَّ لَكَ الحَمْدُ انْتَ نُورُ السَمَوات وَالأَرْضِ وَمَنْ فيهِنَّ وَلَكَ الحَمْدُ انْتَ قَيُومُ السَمَوات والأرْضِ وَمَنْ فيهِنَّ ، وَلَكَ الحَمْدُ انْتَ ربُّ السَمَوات وَالأرْضِ وَمَنْ فيهِنَّ ، وَلَكَ الحَمْدُ انْتَ الحَقُ ووَعْدُكَ الحَقُ ، وَقَولُكَ الحَقُ وَلقَائُكَ حَقٌ ، وَالجَنَّـةُ حَـقٌ ، وَالنَّـارَ حَـقٌ ، والنَبيِّـونَ حَقٌ ، وَمُحَمَدٌ ، وَالسَاعَةُ حقٌ ، اللهُمَّ لَكَ أسْلَمْتُ وَبِكَ امَنْتُ ، وَعَلَيكَ

تَوَكَّلْتُ ، وَإِلَيكَ أَنَبْتُ ، وَبِكَ خَاصَمْتُ وَإِلَيكَ حَاكَمْتُ ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَ مَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ أَنْتَ إِلَهِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ))[٥].

واتە: (ابن عباس) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنیوەشەودا بەئاگا بهاتایە بۆشەونوێژ دەیفەرموو: ((پەروەردگارا! سوپاس و ستایش بۆ تۆیە، تۆی نورو رووناکی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی لەنێویاندایە ، پەروەردگارا ! سوپاس و ستایش بۆ تۆیەو هەرتۆیت راگرو بەدەستەلاَتی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندایە، پەروەردگارا! سوپاس و ستایش بۆ تۆیەو تۆی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی لەنێویاندایە ، خوایەگیان تۆ حەق و ڕاسایت و هەریەك لەوتەو دیدارو بەهەشت و دۆزەخ و پێغەمبەران و (محمد)و قیامەت حەق و راستن، پەروەردگارا! من خۆم بەتۆسپاردووەو باوەڕو پشتیوانی و گەڕانەوەو بەربەرەکانی و دژایەتی و دادوەریم هەر بەتۆیەو داواخوازم لەگوناهەکانی پێشوو دواو پەنهان و ئاشکرام ببوریت و تۆی پەروەردگاری تاك و تەنیایت)).

---

[٥] متفق علیه.

٦ ـ عَنْ عَائشَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُفْتَتِحُ صَلاَتَهُ اذَا قَامَ الَى الليلِ: اللهُمَّ رَبَّ جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَاسْرَافِيلَ ، فَاطِرَ السَمَوات وَالأَرْض ، عَالِمُ الغَيبِ وَالشَهَادَة ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيه يَخْتَلفُونَ اهْدِني لِمَا اخْتَلَفَ فِيه مِنَ الحَقِ بِأَذْنِك أَنَكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ الَى صِرَاطِ مُسْتَقِيم))[٦].

واتە: خاتوو (عائشە) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستپێکی شەونوێژی بەم نزایەدەکرد: ((پەروەردگارا! ئەی پەروەردگاری جبریلو میکائیلو ئیسرافیلو بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەویو زانای هەموو پەنهانو ئاشکرایەك، هەر تۆی دادوەریی نێوان بەندەکانت دەکەیت کاتێك جودایی دەکەوێتە نێویانەوە، خوایەگیان ڕێنوێنی من بکە بۆلای حەقو ڕاستی بەیاوەری ڕەزامەندی خۆت؛ چونکە هەرتۆی ڕێنوێنی دەری خوازیارانی شەقامە ڕێی ڕاستو ڕەوان)).

## دوعای ڕکوعو کڕنووش

٧ ـ قَالَتْ عَائشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُكْثِرُ أنْ يَقُولَ فِي رُكوعِه وَسُجُوده: [سُبْحَانَكَ اللهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ ، اللهُمَّ اغفِرْلِي] يَتَأَولُ القُرانَ ))[٧].

---

[٦] اخرجه مسلم.

[٧] متفق عليه.

تُرِيدُ قَوْلَهُ تَعَالَى: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً﴾ [(النصر:٣)].

واته: خاتوو (عائشه) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پتر لەرکوعو کڕنووشدا دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ پاکیزەییو بێگەردیو ستایش بۆ تۆیە، پەروەردگارا؛ لێم خۆشو ببوورە)) ئنجا قورئانی ڕاقەو لێکدەدایەوە)).

مەبەستیشی ڕاقەو لێکدانەوەی ئایەتی: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً﴾ [(النصر:٣)]. واته: ((ئیتر تۆ سوپاسو ستایشی پەروەردگارت بکەو داوای لێخۆشبوونی لێبکە ، چونکە بەڕاستی خوا زۆر چاوپۆشی دەکاتو تەوبە وەرگرە..))[٨].

٨ ـ وَمِنْهَا أَيْضاً قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: ((سبوحٌ قُدوسٌ ربُّ المَلاَئِكَةِ وَالرُوح))[٩].

واته: هەر لەخاتوو (عائشه)وە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەرکوعو کڕنووشدا دەیفەرموو: ((پەروەردگارا تۆی گورجو خێراو بێکەمو کوڕی، هەر تۆشی پەروەردگاری فریشتەکانو جوبرەئیل)).

---

[٨] تەفسیری ئاسان: ٦٠٣.

[٩] اخرجه مسلم.

٩ ـ وَعَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) أنَّهُ سَمِعَ النَبيَّ (ﷺ) يَقُولُ اذا رَكَعَ [سُبْحَانَ رَبيَّ العَظيم] ثَلاثُ مَرَاتٍ ، وَاذا سَجَدَ قَالَ: [سُبْحَانَ رَبِيَّ الأعْلَى] ثَلاثُ مَرَاتٍ))[١٠].

واته: (حذيفه) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: كاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) بچەمايەتەوەو بچوايەتە ركوعەوە سێ‌جار دەيفەرموو: ((بێگەردی‌و پاكی بۆ خوای مەزنم)) ، كاتێكيش كڕنووشی ببردايە سێ‌جار دەيفەرموو: ((بێگەردی‌و پاكی بۆ خوای بەرزو بڵند)).

١٠ ـ وَفي حَديث عَلي (ﷺ) ، عَن صَلاَة رَسُولِ الله (ﷺ) : وَاذا رَكَعَ يَقول في ركُوعه: ((اللهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ وَبِكَ آمَنت وَلَكَ أسْلَمْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِي وَعَظْمِي وَعَصَبِي)) وَاذا سَجَدَ يَقُولُ في سجُوده : ((اللهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنت وَلَكَ أسْلَمْتُ ، سَجَدَ وَجْهي لِلَذي خَلَقَهُ وَصَوَرَهُ وَشَقَ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ ، تَبَارَكَ الله أحْسَنَ الخَالقِين))[١١].

واتە: لەميانەی فەرموودەكەی (علی)دا ـ ڕەزای خوای خوای لێبێت ـ هاتووە دەفەرموێت: هەركاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) بچەمايەتەوە لەركوعدا دەيفەرموو: ((پەروەردگارا؛ ركوعم بۆ تۆ بردووەو باوەڕم بەتۆ هێناوەو نەفسی خۆشم بەتۆسپاردووەو، گوێ‌و ديدەو مۆخ‌و كرۆك‌و ئێسقان‌و

---

[١٠]اخرجه الأربعة.

[١١]اخرجه مسلم.

ڕەگەکانم هەموویان ملکەچ و نەویون بۆ تۆ )) ، هەروەها لەکاتی کڕنووش بردنیشدا دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ کڕنووشم بۆ تۆ بردووەو باوەڕم پێهێناویت و ڕیشەو جڵەوی نەفسم هەر بەتۆ سپاردووەو ، ڕووخسارم کڕنووشی برد بۆ ئەو پەروەردگارەی بەدی هێناو پاشان وێنای کێشاو گوێ و دیدەی پێبەخشی، مەزن و بڵندبێت ئەو پەروەردگارەی باشترین بەدیهێنەرو کردگارە)).

١١ ـ عَنْ أبِي هُرَيرَةَ (ﷺ) ، أنَّ رَسُولُ الله (ﷺ) كَانَ يَقُولُ فِي سجُوده: ((اللهُمَّ اغفرلِي ذَنْبِي كُلَّهُ دقَّهُ وَجلَّهُ ، وأولَهُ واخِرُهُ وَعَلاَنيهُ وَسِرَهُ))[١٢].

واتە: (ابی هريره) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتی کڕنووش بردندا دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ لەگوناهو تاوانەکانم بەگەورەو بچووك و پێش و پاش و دیارو ئاشکراوە ببوورە)).

١٢ ـ وَقَالَتْ عَائشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: فَقَدْتُ النَبيَّ (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ [مِنَ الفِرَاشِ] فَالتَمَسْتُهُ فَوَقَعْتَ يَدِيَ عَلَي بَطْنِ قَدَمَيهِ وَهُوَ فِي المَسْجِدِ وَهُمَا مَنْصُوبَتَانِ وَهُوَ يَقُول: [اللهُمَّ انِيَ أعُوذُبِكَ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطكَ وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عقُوبَتكَ وَأعوذُبِكَ مِنْكَ ، لاَ احْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ ، انتَ كَمَا اثنَيتَ عَلَى نَفْسك][١٣].

---

[١٢] رواه مسلم.

[١٣] اخرجه مسلم.

واتە: خاتوو(عائشە) ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: شەوێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەرجێگەکەی نەمابوو ، منیش گەرام بەدوایداو لەمزگەوت دۆزیمەوەو دەستم کوتا هەتا دەستم بەرلەپی پێی کەوت و لەکڕنووشدابوو ؛ دەیفەرموو: پەروەردگارا؛ پەنا بەڕەزامەندیت دەگرم لەخەشم وقینت و پەنا بەلێخۆشبوون و لێبوردەیت دەگرم لەسزاو تۆڵەت و، پەناشت پێدەگرم لەخودی خۆت، خوایەگیان هەرچەندستایشی تۆ بکەم ناتوانم بگەم بەپەرێزی ئەوستایشەی خۆت هی نەفسی خۆتتکردووە)).

## دوعای دوای بەرزبوونەوە لەرکوع

١٣ ـ وَقَالَ أبوهُرَيرَةَ (ﷺ): كَانَ رَسُولُ اللهُ(ﷺ) يَقُولُ: [سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ] حِينَ يَرْفَعُ صَلْبَهُ مِنَ الركوعِ ثُمَّ يَقُول وَهُوَ قَائِمٌ [رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ][١٤].

واتە: (ابی هریره) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەرکاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەرکوع هەڵدەستایەوە دەیفەرموو: ((پەروەردگار گوێبیستی سوپاسگوزارو ستایشکاران بوو)) ئەوجا پشتی ڕێك دەبوویەوەو بەرێکی دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە)).

---

[١٤] رواه البخاري ومسلم.

١٤ ـ وَقَال رِفَاعَةَ بنُ رَافِعٍ (ﷺ): كُنَّا يَوْمَاً نُصَلِي وَراءَ النبيِّ (ﷺ) فَلَمَّا رَفَعَ رَاسَهُ مِنَ الرَكْعَة قَالَ: [سَمعَ الله لِمَنْ حَمدَهُ] فَقَالَ رَجُل وراءَهُ [رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ حَمْداً كَثِيراً طَيباً مُبَارَكَاً فِيه]فَلَمَا انْصَرَفَ قَالَ: مَنِ المُتَكَلم؟ قَالَ: انَا ، قَالَ: رَايتُ بِضْعَةً وَثَلاثِين مَلَكَاً يَبْتَدِرُونَهَا ايُهم يَكْتُبُهَا اوَّل))[١٥].

واتە: (رفاعە) ی (رافع) ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: ڕۆژێکیان لەدوای پێغەمبەرەوە (ﷺ) نوێژمان دەکردو کاتێ سەری بەرزکردەوە لەرکوع فەرمووی: پەروەردگار گوێبیستی سوپاسگوزارو ستایشکارانبوو، پیاوێکیش لەدوایەوە وتی: ((پەروەردگارا؛ سوپاس وستایشێکی بێپایان و پاك و پیرۆزت دەکەم)) کاتێ لەنوێژبوونەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: کێبوو وای وت؟ پیاوەکەش وتی: من بووم، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: سیو ئەوەندە فریشتەم بینی کەوتنە پێشبڕکێ ئاخۆ کامیان لەپێش ئەوانی دیکەوە تۆماری بکات)).

١٥ ـ وَفِي حَدِيث عَلِي (ﷺ) عن صَلاةَ رَسُول الله (ﷺ) : وَاذَا رَفَعَ رَاسَهُ مِنَ الرکوعِ يَقُول: ((سَمعَ الله لِمَنْ حَمدَهُ رَبنَا وَلَكَ الحَمْدُ ، مِلءَ السَموَاتِ وَمِلءَ الأرضِ وَمِلءَ مَابَيْنَهُمَا ، وَمِلءَ مَاشِئْتَ مِنْ شيٍ مِنْ بَعْدُ ))[١٦].

---

[١٥] اخرجه البخاري.

[١٦] رواه مسلم.

واتە: هەر لەمیانەی فەرموودەکەی (علی) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ هاتووە دەفەرموێت: کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەری لەرکوع بڵندبکردایەتەوە دەیفەرموو: پەروەردگار گوێبیستی سوپاسگوزارو ستایشکارانی بوو، پەروەردگارا؛ سوپاس و ستایش بۆ تۆیە بەئەندازەی سەرلێوپڕاوپڕی ئاسمانەکان و زەوی و ماوەی نێوانیان و، بەئەندازەو سەرلێوپڕاوپڕی هەمووشتێکی دیکە کەواخۆت خوازیاری بیت)).

## دوعای وچانی نێوان هەردوو کڕنووش

١٦ ـ عَنْ ابنِ عَبَاس (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَقُولُ بَيْنَ السَجْدَتَينِ: ((اللهمَّ اغْفِرْ لِي وَارحَمْنِي واهْدِنِي واجْبِرْنِي وَعَافِنِي ، وَارزُقْنِي))[١٧].

واتە: (ابن عباس) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەوچانی نێوان هەردوو کڕنووشدا دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ لێم ببورەو بەسۆزو میهرەبە لەگەڵم و ڕێنموییم و گوێڕایەڵی و لەش ساغی و ڕۆزیم پێ ببەخشە)).

١٧ ـ وَفِي حَدِيث حُذَيفَةَ (ﷺ) أنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ يَقُولُ بَيْنَ السجْدَتَيْنِ: ((رَبِّ اغفِرْ لِي ، رَبِّ اغفِرْ لِي ))[١٨].

---

[١٧] اخرجه أبوداود وغيره.

واتە: لەمیانەی فەرموودەکەی (حذیفە)دا ـ ڕەزای خوای لێبێت هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەوچانی نێوان هەردوو کڕنووشدا دووجار دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ لێم ببورە )).

## دوعای پاش شایەتومان

١٨ ـ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا انَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ يَدْعُو فِي الصَلاَة: ((اللّهُمَّ انِي اعُوذُبِكَ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ ، وَاعُوذُبِكَ مِنْ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَجَالِ ، وَاعُوذُبِكَ مِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالمَمَات، اللهُمَّ انِي اعُوَذُبِكَ مِنَ المأثَمِ وَالمَغْرَمِ)) فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: مَا اكْثَرَ مَا تَسْتَعِذُ مِنْ المَغْرَمِ؟ فَقَالَ: ((انَّ الرَجُلَ اذَا غَرِمَ حَدَثَ فَكَذَبَ وَوَعَدَ فَاخْلَفَ))[١٩].

واتە: خاتوو (عائشە) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنوێژدا دوعای دەکردو دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ پەنادەگرم بەتۆ لەسزای نێوگۆڕو فیتنەو ئاشوبی چاوبەستی دەجال‌و زیندوو مردوان، پەروەردگارا؛ پەناتپێدەگرم لەگوناهو تاوان‌و باری گرانی قەرزاری)) یەکێك لەیارانیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر دەتبینم پەنا دەگریت بەخوا لەقەرزاری؟ فەرمووی: بەڵێ ؛ ((مەردوم کاتێك

---

[١٨] اخرجه ابوداود وغيره.

[١٩] متفق عليه.

قـەرزاربوو دەكەوێتـە پاسـاوهێنان و لەئـەنجامدا تووشـی درۆدەبێت و هەر پەیمانێكیش دەدات نایباتەسەر)).

١٩ ـ وَعَنْ عَبْدُالله بنُ عَمْرُو (ﷺ)، انَّ اَبَابَكْرِ الصديقَ (ﷺ) قَالَ لرَسُولِ الله (ﷺ): عَلمْنِي دُعَاءً ادعُوبِه فِي صَلاَتِي ، قَالَ: ((قُلْ اللهُمَّ اني ظَلَمْتُ نَفسِي ظُلْماً كَثيراً وَلاَ يَغْفرُ الذنُوبَ الاَّ انْتَ ، فَاغْفرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي انَّكَ اَنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيم))[٢٠].

واتـە: (عبـدالله) ی كوڕی (عمـرو) ـڕەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت: (ابوبكر)ی (صديـق) ـ ڕەزای خـوای لێبێـت ـ بەپێغەمبـەری خـوای وت : نـزاو دوعایـەكم فێربكـە هـەتا لـەنوێژدا بیكـەم، پێغەمبـەریش (ﷺ) فـەرمووی: بڵـێ : ((پەروەردگارا؛ من ستەمێكی گەورەو گرانم لەنەفسی خـۆم كردووەو كەسیش شك نابەم لێخۆشبووی گوناهو تاوان تۆ نەبێت ، خوایە گیان داواكارم بەلێخۆشبوونی خۆت سـۆزو بـەزەیت پێمدابێتـەوەو بمبـووری چونكـە هـەر تـۆی لێخۆشبووی سۆزدارو بەبەزەیی)).

٢٠ ـ وَفِي حَدِيث عَلي (ﷺ) عَنْ صِفَة صَلاَة النبيِّ (ﷺ) انَّهُ كَانَ يَقُولَ فِي اخرِ مَا يَقُولُ بَيْنَ التَشَهُدِ وَالتَسْليم: ((اللهُمَّ اغفرِ لِي مَا قَدَمْتُ وَمَا اخَرْتُ وَمَا اسْرَرْتُ وَمَا اَعْلَنْـتُ وَمَـا

---

[٢٠] متفق عليه.

اسْرَفْتُ وَمَا انْتَ اعْلَمُ بِهِ مِنِّي، انْتَ المُقَدِمِ وَانْتَ المُؤَخِرُ لاَ الِهَ الاّ انْتَ))[21].

واتە: هەر لەمیانەی فەرموودەکەی(علی)دا ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ سەبارەت بەچۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە دەفەرموێت: لەکۆتا وتەی نێوان شایەتومان و(گەواهیدان) سەلامدانەوەیدا دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ گوناهو تاوانی پێشین و دوایین و دیارو ئاشکراو زیادەڕەویم و ئەوەی تۆ ئاگادارو زانای پێی ببورەو، هەر تۆی پاش و پێشخەرو تاک و تەنیاو بێهاوتایت)).

## نزاودوعاکانی دوای سەلامدانەوە

٢١ـ قَالَ ثَوْبَان (ﷺ) : كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) اذا انْصَرَفَ مِنْ صَلاَتِه اسْتَغْفَرَ الله ثَلاَثاً وَقَالَ: ((اللهُمَّ انْتَ السَلاَمُ وَمِنْكَ السَلاَم تَبَارَكْتَ يَاذا الجَلاَلِ وَالأكْرَام))[22].

واتە: (ثوبان)ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەرکات پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنوێژبوبوایەتەوە سێ وسێ جار داوای لێخۆشبوونی دەکرد لەپەروەردگارو پاشان دەیفەرموو: (پەروەردگارا؛ تۆی سەرچاوەو خاوەن ئاشتی و بەرزوبڵندبیت ؛ ئەی شکۆمەندو ڕێزداری پیرۆز)).

---

[21] اخرجه مسلم.
[22] اخرجه مسلم.

٢٢ـ وَعَنْ مَعَاذِ بنُ جَبَلٍ (ﷺ) أنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) أخَذَ بِيدِهِ وَقَالَ: (يَا مَعَاذ ؛ انِي وَالله لأُحِبُكَ ، فَلاَ تَدعَنَ فِي دُبُرِ كُل صَلاَةٍ أنْ تَقُولَ: ((اللهمَّ أعنِي عَلَى ذِكرِكَ وَشُكرِكَ وَحُسنِ عِبَادَتِكَ))[٢٣].

واته: (معاذ) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستی گرتمو وتی: ((سوێندبێت بەخوا من تۆم خۆشدەوێتو داواکارم لەدوای هەموو نوێژێك دەستبەرداری ئەم نزایە نەبیت : پەروەردگارا؛ پشتگیروکۆمەکیم بکە لەسەر سوپاسگوزاریو بەندایەتیتو بەباشترینو جوانترین شێواز)).

٢٣ ـ وَعَنْ المُغِيرَةَ بنُ شُعْبَةَ (ﷺ) : أنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ اذَا فَرِغَ مِنَ الصَلاَةَ قَالَ: لاَ الَهَ الاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلَّ شئٍ قَدِير ، اللهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا اعْطَيْتَ وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِ مِنْكَ الجَد))[٢٤].

واته: (مغیرە) ی کوڕی (شعبە) ـڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەنوێژ ببوایەتەوە دەیفەرموو: ((پەروەردگار تاكو تەنیاو بیٚهاوتاو هاوەڵەو

---

[٢٣] اخرجه ابوداود والنسائي ، وقال الالباني اسناده صحيح رجاله كلهم ثقات.

[٢٤] متفق عليه.

خاوەنی سەرجەم بوونەو ستایش‌و سوپاسگوزاری بۆ ئەوەو توانای ئەنجامدانی هەموو ویستێکی هەیە، پەروەردگارا؛ رێگر نی‌یە لەئانای یەکێکدا تۆ خوازیاری بەخشین بیت پێی‌و کەسیش نییە بتوانێت بیبەخشێت گەر تۆ رێگرو بەربەست بوویت، خوایەگیان تۆی دەوڵەمەندی بەتواناو هیچ دەوڵەمەندو بەتوانایەك نی‌یە مەگەر گوێڕایەڵ‌و ملكەچی بۆ تۆ بنوێنێت)).

٢٤ ـ وَعَنْ عَبْدُالله بنُ الزُبَيْر (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) اذَا سَلَّمَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ يَقُولُ: لاَ الَهَ الاّ الله وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَئٍ قَدِير ، لاَحَوْلَ وَلاَ قُوَةَ الاَّ بِالله لاَ الَهَ الاّ الله ، وَلاَ نَعْبُدُ الاّ ايَّاهُ ، لَهُ النعْمَةُ وَلَهُ الفَضْلُ، وَلَهُ الثَنَاءُ الحَسَنِ، لاَ الَهَ الاّ الله مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْكَرِهِ الكَافِرُونَ))[٢٥].

واتە: (عبدالله)ی كوڕی (زبیر) دەفەرموێت: هەركاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەدوای هەموو نوێژێك سەلامی بدایەتەوە دەیفەرموو: ((پەروەردگار تاك‌و تەنیاو بێ‌هاوەڵەو خاوەنی سەرجەم بوونەوەرەو، سوپاس‌و ستایش هەر بۆئەوەو توانای ئەنجامدانی هەموو ویستێكی هەیە، خوایەگیان پەناو پشتگیرو هێزو دەستەلآت نی‌یە تۆ نەبێت‌و؛ تۆی تاك‌و تەنیاو، ئێمە هەر تۆ دەپەرستین‌و

---

[٢٥] رواه أحمد ومسلم وأبوداود والنسائي.

خاوەنی هەموو نازو نیعمەتو شکۆمەندییەکی، ستایشی بێپایانمان هەیە بۆتو، تاکو تەنیایتو بەدڵسۆزیو ئەمەکداری دەتپەرستین گەرچی بێباوەڕان نیگەرانو سەغڵەت بن بەم گوتەیەی ئێمە)).

٢٥ ـ عَنْ عَقْبَةَ بنُ عامر قال: ((امَرَني رَسُولُ الله (ﷺ) أنْ أقرأ المعْوَذات دُبُرَ كل صَلاَة))[٢٦].

واتە: (عقبە)ی کوڕی (عامر) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێدام لەدوای هەموو نوێژێك ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾ بخوێنم)).

٢٦ ـ وَعَنْ ابِي امَامَةَ انَّ النَبيَّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ قَرَأ ايةَ الكُرْسي دُبُرَ كُل صَلاَةٍ لَمْ يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُول الجَنَةِ الا المَوْتَ))[٢٧].

واتە: (ابی امامە) لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هەرکەسێك (ایە الکرسی)بخوێنێت ئەوا هیچ ڕێگرێك نییە لەئاستی چوونە بەهەشتی جگە لەمردن زیاتر)).

---

[٢٦] اخرجه احمد وابوداود والترمذي والنسائي وصححه ابن حبان.

[٢٧] رواه النسائي والطبراني.

وَعَنْ عَلِي (رضي الله عنه) أنَّ النَبِيَّ (ﷺ) قَالَ: مَنْ قَرَا ايَةَ الكُرْسِيِ فِي دُبُرِ الصَلاَةِ المَكْتُوبَةَ كَانَ فِي ذِمَةِ اللهِ الى الصَلاَة الأُخْرَى))[٢٨].

واتە: (علی) -رەزای خوای لێبێت - لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: (هەرکەسێك لەدوای هەموو نوێژێك (ایە الكرسی) بخوێنێت بێگومان دەچێتە ئەستۆو ژێر پارێزگاری پەروەردگار هەتا نوێژێکی دیکە دادێت)).

٢٧ - وَعَنْ أبِي هُرَيرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ الله (ﷺ) قَالَ : ((مَنْ سَبَحَ فِي دُبُرِ كُل صَلاَةٍ ثَلاَثٌ وَثَلاَثِينَ ، وَحَمَدَ ثَلاَثاً وَثَلاَثِين، وَكَبَرَ اللهَ ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ وَقَالَ تَمَامَ المائَةَ : لاَ الهَ الاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْد وَهُو عَلَى كُلِّ شئٍ قَدْير، غُفِرَتْ لَهُ خَطَاياهُ وَانْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ))[٢٩].

واتە: (ابی هریرە) - رەزای خوای لێبێت . لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((هەرکەسێك لەدوای هەموو نوێژێك سی‌وسی‌جار (سبحان اللە)و (الحمد للە)و (الله اكبر) بكات‌و لەجاری سێیەمدا بڵێ: پەروەردگار تاك‌و تەنیاو بێ هاوەڵ‌و هاوتایەو ، سەرجەم بوون‌و سوپاس‌و ستایش هەر بۆ ئەوەو توانای بەجێگەیاندنی هەموو

---

[٢٨] رواه الطبراني باسناد حسن.

[٢٩] اخرجه مسلم.

ویستێکی هەیە ، ئەوا لەتاوان و گوناهەکانی دەبورێت گەر بەئەندازەی کەفی سەردەریاش بێت)).

٢٨ ـ عَنْ ابي امَامَةَ قَالَ: مَادَنَوْتُ منْ نَبِيكُمْ (ﷺ) فِي صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ وَلاَتَطَوعٍ الاَّ سَمعْتُهُ يَدْعُو بِهؤُلاَء الكَلمَات لاَيَزِيدُ وَلاَ يَنْقُصُ مِنْهُنَّ ((اللهُمَّ اغْفِرلِي ذنُوبِي وَخَطَايَايَ كُلَّهَا ، اللهُمَّ انْعُشْنِي وَاجبرْنِي ، وَاهْدِنِي لصَالحِ الأعمَال وَالأخلاَق فَأنَّهُ لاَ يَهْدِي لِصَالحِهَا وَلاَ يَصْرِفُ سَيِئَهَا الاَّ أنْتَ))[٣٠].

واتە: (ابی امامە) ـرەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: لەهەر نوێژێکی فەرز یان سوننەتدا لەپێغەمبەری خوا نزیك بوویمەوە گوێم لێبووە ئەم نزاو دوعایەی کردووەو کەم و زیادی تێدا نەکردووە: ((پەروەردگارا! لەسەرجەم گوناهو تاوانەکانم ببورە، پەروەردگارا! بڵندو گوێڕایەڵ و ملکەچ و رێنوێنم بکە بۆلای کرداروو رەفتارو رەوشی چاکەو جوان بەڕاستی هەر تۆی رێنوێن دەری بۆلای چاکەو رەفتاری جوان و رێگریش لەگرتنەبەری رەوش و رێگەی خراپ و نابار)).

٢٩ ـ انَّ سَعْد بنُ وَقَّاص (ﷺ) يَعَلمُ بَنِيه هَؤُلاَء الكَلمَات كَمَا يُعَلم المُعَلمُ الغلْمَان الكِتَابَة، اويَقُول انَّ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) كَانَ يَتَعَوَّذُ بِهِنَّ دُبُرَ الصَلاَة: ((اللهُمَّ انِي أعُوذُبِكَ مِنَ الجُبْنِ

---

[٣٠] رواه الطبراني وابن السني.

وَاعُوذُبِكَ اَنْ اردَّ الَى ارْذَلِ العُمْرِ ، واعُوذُبِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُنْيَا وَاعُوذُبِكَ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ))[٣١].

واته: (سعد)ی کوڕی (ابی وقاص) ـ رەزای خوای لێبێت ـ ئەم نزایانەی فێری وەچەکانی دەکرد بەچەشنی فێرکردنی نووسین بۆ مندالأن لەلایەن مامۆستایانەوەو دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەدوای هەموو نوێژێك پەنای دەگرت بەپەروەردگارەکەی لەم حاڵوبارانەو دەیفەرموو: پەروەردگارا ؛ پەناتپێدەگرم لەرژدونێرەیی‌و ترسنۆکی‌و پیریی‌و فیتنەو ئاشوبی دنیاو سزاو ئەشکەنجەی ناوگۆڕ)).

# چەند دوعایەك لەبۆنەو کاتە جیاوازەکاندا

## دوعای دوای سوننەتی نوێژی بەیانی

٣٠ ـ عَنْ ابِي مَلِيحٍ عَنْ ابِيهِ انَّهُ صَلَّى رَكْعَتَي الفَجْرِ وانَّ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) قَرِيبًا مِنْهُ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ ثُمَّ سَمِعَهُ يَقُولُ وَهُوَ جَالِسٌ: ((اللهُمَّ رَبَّ جِبْرِيلَ وَاسْرَافِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَمُحَمَّدٍ النَّبِيِّ (ﷺ) اعُوذُبِكَ مِنَ النَّارِ))[٣٢].

واته: (ابی ملیح) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: دووڕکات نوێژی بەیانیم کردو پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزیك بوو لێمەوەو دووڕکات نوێژی

[٣١] رواه البخاري والترمذي.

[٣٢] رواه ابن السني.

ئاسان و هێواشی کردو دواتر دانیشت و سیٚجار فەرمووی: ((پەروەرگارا؛ تۆی خوای جبریل و ئیسرافیل و میکائیل و محمدی فرستادە داواکارم لەئاگری دۆزەخ بەدوورم بگریت)).

٣١ ـ عَنْ سَعْدِ بنُ ابِي وَقَاص (ﷺ) انَّ رَجُلاَ جَاءَ الَى الصَلاَة وَرَسُول الله(ﷺ) يُصلي فَقَالَ حِينَ انْتَهى الَى الصَف: ((اللهُمَّ اتِنِي افْضَلَ مَاتُؤْتِي عِبَادك الصَالحينَ ، فَمَا قَضَى رَسُول الله (ﷺ) قَال: ((مَن المتَكَلم انفاً ؟ قَال: انَا يَارَسُولَ الله : قَال: اذَن يَعقَرُ جَوَادكَ وَتَشْهَد فِي سَبِيلِ الله تَعَالَى))[٣٣].

واتە: (سعد)ی کوڕی (ابی وقاص) ـ ڕەزای خوای لیبێت ـ دەفەرموێت: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەرو لەوكاتەدا پێغەمبەرو موسوڵمانان نوێژیان دەكرد، پیاوەكە خۆی گەیاندە ڕیزەكەو نوێژی دابەست و وتی: پەروەردگارا؛ پێم ببەخشە چاكترین بەشێك كەوا دابێتت بەبەندە خواناسەكانت)) دوای تەواوبوونی لەنوێژ پێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسی: کێبوو ئەو نزایەی کرد؟ پیاوەکەش وتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەویش (ﷺ) فەرمووی:

---

[٣٣] رواه النسائي وابن السني ورواه البخاري في ترجمة محمد بن مسلم بن عائذ.

کەواتــە ئەســپەکەت برینــدار دەکــەوێت و تــۆش شــەهید دەکرێیت لەپێناوی خوادا)).

## دوعای دوای نوێژی بەیانی

٣٢ ـ عَنْ ام سَلَمَةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهَا قَالَت: كَانَ النَبِـيُّ (ﷺ) يَقُولُ بَعْدَ صَلاَة الفَجْرِ : ((اللهُمَّ انِي اسْألُكَ رِزْقَاً طَيِباً ، وَعِلْماً نَافِعَاً ، وعَمَلاً مُتَقَبلاً))[٣٤].

واتــە: خــاتوو (ام ســلمه) ـ ڕەزای خــوای لێبێــت ـ دەفەرموێت: لەدوای هەموو نوێژێکی بەیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: ((پـەروەردگارا؛ داواکارو خوازیـاری رزق و بژێوی‌یـەکی پـاک و بێگــەردو ، زانیارییــەکی ســوودمەندو کردارو ڕەفتارێکی گیراو قبوڵم لێت)).

## دوعای قنوت

٣٣ ـ عَنْ الحَسَنْ بنُ عَلِيِّ(ﷺ) قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ الله (ﷺ) كَلِمَاتِ اقُولهُنَّ فِي الوَتَرِ: ((اللهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ ، وَعَافِنِي فِيمَن عَافَيْت ، وتَولَنِي فِيمَن تَوَلَيْتَ ، وَبَارِكَ لِي فِيمَا أعْطَيْتَ ، وَقِنِي شَرَ مَاقَضَيْتَ ، فَأنَكَ تَقْضِي ولاَ يُقْضَى عَلَيْكَ ، وَانَّـهُ

[٣٤] رواه الطبراني في الصغير ورجاله ثقات.

لاَيَذلُ مَنْ وَالَيْتَ ، وَلاَ يَعِزُ مَنْ عَادَيْتَ ، تَبَارَكْتَ رَبَنَا وَتَعالَيْتَ ، وَصَلَى اللهُ عَلَى النَبيِّ محمد))[٣٥].

واتـه: (حسـن) كـوڕی (علـی) ـ ڕەزای خوایـان لێبێـت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێری ئەم دوعایەی كردم لـەنوێژی (وتـر)دا بیخوێنـم: ((پـەروەردگارا؛ ڕێنمویـم بكـە لـەریزی ئەوانـەی ڕێنوینـی كـراون‌و ، لـەش ساغیشـم بكـە لەگەڵ لەش ساغ‌و تەندروست باشانداو، كاروبارەكانم بگرە ئەستۆی خۆت هـەروەك چـۆن كاروبـاری خواناسـانت گرتـە دەست‌و، فەڕو پتریی بخە نێو نـازو نیعمەتی ئامێز ئاسام‌و، لەشـەڕو خراپـەی چـارەنووس‌و قـەزای خراپیـش بـەدوورم بگرەو بەڕاستی هـەر تۆی چـارەنووس سـازو قـەزاوەتدەری تـاك‌و تـەنیایت‌و ئەوانەی تۆپـەناو پشتگیریان بیـت هـەرگیز ملكـەچی‌و شكسـت نایـەت بەسـەریانداو ئەوانـەش تـۆ دژایـەتی‌یان دەكـەیت بێگومـان هەمیشـە لـەبڵندی‌و شكۆمەندیی بیٚبەش دەبن، پەروەردگارا؛ هەمیشە هـەر بـالاْو بڵندو پیرۆزبیت‌و سلاْویش بدە لەدیاری پێغەمبەر(ﷺ)).

---

[٣٥] قال الترمذي هذا حديث حسن وقال لا يعرف عن النبي (ﷺ) في القنوت شئ أحسن من هذا وقال النووي إسناده صحيح.

## دوعای وادەو کاتی بانگی شێوان ( ئێوارە )

٣٤ ـ عَنْ ام سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: ((عَلَمَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) انْ اقُولَ عِنْدَ اذَانِ المَغْرِبِ : ((اللهُمَّ هَذَا اقْبَالُ لَيْلِكَ وَادْبَارُ نَهَارِكَ وَاصْوَاتُ دُعَاتِكَ فَاغْفِرْ لِي))[٣٦].

واتە: خاتوو (ام سلمە) ی دایکی موسوڵمانان ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێری کردم لەوادەو کاتی بانگی شێواندا بڵێم: ((پەروەردگارا؛ وا شەو داهات و رۆژ ئاوابوو دەنگی خواناس و بانگخوازانیشت بەرەو قاپی تۆ بڵند بوەتەوەو تکام وایە بم بەخشی)).

## دوعای دوای نوێژی شێوان

٣٥ ـ عَنْ ام سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) اذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلاَةِ المَغْرِبِ يَدْخُلُ فَيُصَلِي رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ يَقُولُ فِيمَا يَدعُو: ((يَا مُقَلِبَ القُلُوبِ ثَبِتْ قلوبُنَا عَلَى دِينِكَ))[٣٧].

واتە: خاتوو (ام سلمە ) ی دایکی موسوڵمانان ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

[٣٦] رواه النووي في سنن ابي داود والترمذي.

[٣٧] رواه النووي في كتاب ابن السني.

لەنوێژی شێوان دەگەڕایەوە ماڵەوە دوو ڕکات نوێژی دەکردو پاشان دەیفەرموو: ((ئەی وەرچەرخێنەری دڵان ؛ دڵەکانمان لەسەر ئاینی خۆت چەسپاوو جێگیر بکە)).

## دوعای دواى نوێژی (وتر)

٣٦ ـ عَنْ عَلِيٍّ (ﷺ) أنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ فِي اخِرِ وِتْرِهِ: ((اللهُمَّ اِنِي اعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ ، وَاعُوذُ بِمُعَافَاتِكَ مِنْ عقُوبَتِكَ ، وَاعوذُبِكَ مِنْكَ ، لاَ أحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ انْتَ كَمَا اثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ ))[٣٨].

واتە: (علی) ی ڕەزای خوای لێبێت . دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدوایین (وتر)دا دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ پەنا دەگرم بەڕەزامەندیت لەغەشمو توڕەییتو ، لەدروستیو لەش ساغیت لەسزاو تۆڵەتو، بەزاتی خۆت لەخودو نەفستو، ناتوانم ستایشی تۆ ژماردە بکەمو، سوپاسو ستایشت دەکەم بەچەشنو شێوازی شایستەو گونجاوی خۆت ئاسا)).

---

[٣٨] سنن أبي داود والترمذي والنسائي وقال الترمذي: حديث حسن.

# دوعای نوێژی پێویستی

٣٧ ـ عَنْ عَبْدُ الله بنُ ابِي اوْفَى (ﷺ) قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُول الله (ﷺ) فَقَالَ: (مَنْ كَانَتْ لَهُ حَاجَةٌ الَى الله تَعَالَى اوْ الَى أحَدٍ مِنْ بَنِي ادَم، فَلْيَتَوَضأ وَلْيُحْسِنِ وَضُوءهُ، وَلْيُصَلِ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَلْيَقُل: ((لاَ الَهَ الاّ الله الحَلِيْمُ الكَرِيم، سُبْحَانَ الله رَبُّ العَرْشِ العَظِيم الحَمْدُ لله رَبُّ العَالَمِين، اسْألُكَ مُوجِبَاتُ رَحْمَتِكَ وَعَزَائِمُ مَغْفِرَتِكَ، والعِصْمَةُ مِنْ كُلِّ ذَنْبٍ، وَالغَنِيمَةَ مِنْ كُلِّ امْرٍ والسَلاَمَةَ مِنْ كُلِ اثْمٍ، لاَ تَدَعْ لِي ذَنْباً الاّ غَفَرْتَهُ وَلاَ هَمَاً الاّ فَرَجْتَهُ، وَلاَ حَاجَةً هِيَ لَكَ رِضاً الا قَضَيْتَها يَا أرحَمُ الرَاحِمِين )) ثُمَّ يَسْألُ مِنْ أمْرِ الدُنيا وَالاخِرَةَ مَاشَاءَ فَانَّه يَقْدِرُ))[٤٩].

واتە: (عبدالله)ی كوڕی (ابی اوفی) ـڕەزای خوای لێبێت ـ دەفـەرموێت: ڕۆژێكیـان پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەماڵـەوە هاتەدەرەوەو ڕووی تێكردین و فەرمووی: ئەوەی پێویستی و داوایەكی هەبێت لەپەروەردگار یان مرۆڤێك بادەستنوێژێكی جوان و بـاش بگرێـت و دووركـات نوێـژ بكـات، پاشـان سوپاس و ستایشـی خـوا بكـات و سـڵاوات بـدا لـەدیاری پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوجا بڵێ: پەروەردگار تاك و تەنیاو نەرم و

---

[٣٩] اخرجه الترمذي والنسائي وابن ماجه.

نیان‌و رێزدارو بەخشندەیە، بێگەردی‌و پاکی بۆ خوای عەرشی مەزن، منیش هەر سوپاس‌و ستایشی پەروەردگاری جیهان دەکەم ، پەروەردگارا؛ داواخوازی ئەو هۆکارانەم کەوا سۆزو میهرو بەزەیی تۆ دەهێننە جۆش‌و کانیاوی لێخۆشبوون هەڵدەقوڵێن‌و دەخەنە گەڕ ، خوایەگیان بەدوورو پارێزراوم بکە لەتاوان‌و گوناهو خێرانداریشم بکە لەسەرجەم چاکەیەك‌و بمپارێزە لەهەموو تاوانێك ، خوایە گیان هیچ گوناهو تاوانێکم مەهێڵە قەڵەمی لێخۆشبوونت نەهێنابێت بەسەریداو هەموو غەم‌و خەفەت‌و سەغڵەتیشم بڕەوێنەرەوەو دەروازەو دەروم لێ والآبکە، خوایەگیان ئەی لەهەمووان بەسۆزو بەزەیی‌تر داواکارم هیچ پێویستیەکم نەهێڵی گەر ڕەزامەندی تۆی لەسەربێت مەگەر بۆم بەجێ‌بگەیەنیت)).

## دوعای هەستان بۆشەونوێژ

٣٨ ـ عَنْ عَبْدُالله بنُ عَبَاس (ﷺ) قَالَ: كَانَ النَبِيُّ (ﷺ) اذا قَامَ منَ الليلِ يَتَهَجَدُ قَالَ: اللهُمَّ لَكَ الحَمْدُ انْتَ قيم السَمَوَاتِ وَالأرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ وَلَكَ الحمد انْتَ نُورُ السَمَوات وَالأرْض وَمَنْ فيهِنَّ ، وَلَكَ الحَمْدُ انْتَ مَلكُ السَمَوَاتِ وَالأرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ ، وَلَكَ الحَمْدُ انْتَ الحَقُ ووَعْدُكَ حَقٌ وَلقَاؤُكَ حَقٌ وقَولُكَ حَقٌ ، وَالجَنَّة حَقٌ وَالنَارُ حَقٌ وَالنَبِيونَ حَقٌ وَمُحَمَدٌ حَقٌ وَالسَاعَةَ حَقٌ ، اللهُمَّ لَكَ اسْلَمْتُ وَبِكَ امَنْتُ ، وَعَلَيكَ تَوَكَلْتُ وَالِيكَ

اَنْتَ وَبِكَ خَاصَمْتَ ، وَاِلَيْكَ حَاكَمْتُ ، فَاغْفِرْ لِي مَاقَدَّمْتُ وَمَا اَخَّرْتُ وَمَا اَسْرَرْتُ وَمَا اَعْلَنْتُ وَمَا اَنْتَ اَعْلَمُ بِهِ مِنِّي ، اَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَاَنْتَ الْمُؤَخِّرُ ، لاَ اِلَهَ الاَّ اَنْتَ ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ الاَّ بِاللهِ))[٤٠].

واتە: (عبدالله)ی کوڕی (عباس) - ڕەزای خوایان لێبێت - دەفەرموێت: کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵدەستا بۆ شەونوێژ دەیفەرموو ((پەروەردگارا: سوپاس و ستایش بۆ تۆی ڕاگرو بەدیهێنەرو نوورو ڕووناکی و خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیانە، پەروەردگارا: سوپاس و ستایش بۆ تۆیەو تۆو پەیمان و دیدارو وتەو بەهەشت و ئاگرو پێغەمبەران و محمدو قیامەت ڕاست و حەقن ، پەروەردگارا: جڵەوی نەفسم بەتۆ سپاردووەو باوەڕو پەناو پشتیوان و گەڕانەوەو داکۆکیم و دادوەریم هەر بەتۆیەو داواخوازم لەگوناهو تاوانی پاش و پێش و دیارو ئاشکراو ئەوەشی تۆ دەیزانی ببوری، خوایەگیان تۆی پێشخەرو دواخەری کردارو ڕەفتارەکان و تاک و تەنیاو بەهێزو تواناو دەستەڵاتیت و کەس نی یە هاوتاو هاوشانت بێت)).

---

[٤٠] رواه البخاري.

# دوعای سوژدەی تیلاوە

٣٩ ـ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا : قَالَتْ: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ فِي سجُود القَران : ((سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ فَتَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنَ الخَالِقِينَ))[٤١].

واتە: خاتوو (عائشە) ی دایكی موسوڵمانان ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) كڕنووشی تیلاوەی قورئاندا دەیفەرموو: ((ڕووخسارم كڕنووشی برد بۆ ئەو زاتەی بەدیهێناوەو گوێو چاوی پێبەخشی بەهێزو پشتیوانی خۆیو، بێگەردو پیرۆزو بڵندبێت ئەو پەروەردگارەی باشترین كردگارە)).

---

[٤١] رواه الخمسة الا ابن ماجه.

# بەشی شەشەم

داوای لێخۆشبوون

پلەوپایەی داوای لێخۆشبوون

لەقورئانی پیرۆزدا

لەسوونەتی پاكو شیریندا

دەستەواژەو شێوازی لێخۆشبوون

شانزای لێخۆشبوون

# پلەوپایەی داوای لێخۆشبوون

# لەقورئانی پیرۆزدا

١ ـ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ، أُولَئِكَ جَزَاؤُهُمْ مَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾ [(آل عمران:١٣٥ ــــ ١٣٦)].

واتە: ((ئەوانەش کەتاوان یان گوناهێك ئەنجام دەدەن ، یاخود ستەم لەخۆیان دەکەن (دوایی بەخۆیاندا دێنەوەو سزای)خوا دێتەوە یادیان، ئەوسا داوای لێخۆشبوون دەکەن، جاکێ هەیە کەلەگوناهان خۆش بێت جگە لەخوا ؟! هەروەها لەسەر گوناهو تاوانیان بەردەوام نابن، لەکاتێکدا دەزانن (ئەوە تاوانە))[1].

٢ ـ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُوراً رَحِيماً﴾ [(النساء:١٠٦)].

---

[1] تەفسیری ئاسان : ٦٧.

واتە: ((داوای لێخۆشبوون لەخوابکە ، چونکە بەڕاستی ئەو خوایە هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە))[٢]

٣ - پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُوراً رَحِيماً﴾ [(النساء: ١١٠)].

واتە: ((ئەوەی خراپەیەك بكات (دژ بەخەڵكی) یان ستەم لەخۆی بكات لەوەودوا بەخۆیدا بچێتەوەو ، داوای لێخۆشبوون لە خوابكات ئەوە خوایەكی لێخۆشبوو میهرەبانی دەستدەكەوێت))[٣].

٤ - پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَنِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ﴾[(هود: ٣)].

واتە: ((هەروەها (خەڵكینە) ! داوای لێخۆشبوون لەپەروەردگارتان بكەن ، لەوەو دوا بگەڕێنەوە بۆ لای ..))[٤].

٥ - پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ [(الأنفال:٣٣)].

واتە: ((بێگومان خوای گەورە (بەقسەی ئەوان ناكات) بەلآو سزا نادات بەسەریاندا ، لەكاتێكدا تۆ لەناویاندا بیتو (بەئومێدی ئەوەی كەهەندێكیان باوەڕ بهێنن) ، هەروەها

---

[٢] تەفسیری ئاسان: ٩٦.

[٣] تەفسیری ئاسان: ٩٦.

[٤] تەفسیری ئاسان: ٢٢١.

خوایش سزادەر نییە لەکاتێکدا ئەوان داوای لێخۆشبوون بکەن))[٥].

٦ ـ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَـهَ إِلَّا اللَّـهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ﴾ [(محمد:١٩)].

واتە: ((ئەی ئینسان!! دەی کەواتە چاك بزانەو دڵنیابە جگە لەخوا هیچ خوایەکی‌تر نیە، داوای لێخۆشبوونی گوناە بۆ خۆت‌و ئیمانداران لەپیاوان‌و ئافرەتان هەر لەوبکەو دڵنیابە کەخوا دەزانێت لەرۆژدا بەچی‌یەوە خەریکن‌و، لەشەویشدا لەکوێ دەحەوێنەوەو ئارام دەگرن، یاخود دەزانێت چی‌دەکەن لەدنیاداو، دەرەنجامەکەشی لەقیامەتدا چۆنە))[٦].

٧ ـ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّاراً، وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَاراً﴾ [(نوح:١١ ــ ١٢)].

واتە: ((بەردەوام پێم دەگوتن : ئێوە داوای لێخۆشبوون لەپەروەردگارتان بکەن چونکە بەڕاستی ئەو زاتێکی لێخۆشبووەو بارانتان بەلێزمەو خوڕەم بۆ دەبارێنێت‌و ماڵ‌و

---

[٥] تەفسیری ئاسان: ١٨٠.

[٦] تەفسیری ئاسان: ٥٠٨.

سامان و نەتەوەتان پێ دەبەخشێت ، هاوڕێ لەگەڵ باخ و باخاندا، رووبارو چەم و جۆگەتان بۆ بەدی دەهێنێت))[7].

٨ ـ پەروەردگار دەفەرموێت:﴿لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ، الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ، الصَّابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنْفِقِينَ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ﴾ [(ال عمران : ١٥ ـ ١٧)].

واتە: ((بۆ ئەوانەی پارێزکارو خواناسن ، لای پەروەردگاریان باخەکانی بەهەشت ئامادەیە بۆیان کە: چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیداو بەبەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە لەگەڵ هاوسەرانی پاکیزەداو بەدەم هەستکردنی بەردەوام بەڕەزامەندی پەروەردگاری ئازیز، بێگومان ئەو خوایە بینایە بەبەندەکانی ، ئەوانەی کەدەڵێن : پەروەردگارا! بەڕاستی ئێمە ئیمان و باوەڕمان هێناوە، وەلەگوناهەکانمان خۆش ببەو لەئاگری دۆزەخ بمانپارێزە، ئەو ئیماندارانەی ئەمە سیفەتیانە خۆگرو ئارامگرن لەبەرامبەر ناسۆرو ناخۆشیەکانی ژیانەوە ، راستگۆو خواپەرستن ، ماڵ و سامان دەبەخشن و ، لەبەرەبەیانەکاندا داوای لێخۆشبوون

---

[7] تەفسیری ئاسان: ٥٧٠ ـ ٥٧١.

لەپـەروەردگاریان دەکـەن چونکـە وا هەسـتدەکەن کـە وەك پێویست خواپەرستیان نەکردووە))[8].

٩ ـ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا﴾ [(النصر:٣)].

واتە: ((ئەوسا ئیتر تۆ سوپاس‌و ستایشی پـەروەردگارت بکەو داوای لێخۆشبوونی لێبکە، چونکە بەڕاستی خـوا زۆر چاوپۆشی دەکات‌و تەوبە وەرگرە))[9].

## پلەوپایەی لێخۆشبوون لەسوننەتی پاك‌و شیریندا

١ ـ عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) يَقُولُ: ((وَاللهِ انِي لأَسْتَغْفِرِ اللهَ وَاَتُوبُ اِلَيْهِ فِي اليَومِ اَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً))[10].

واتـە: (ابـی هریـرە) ـ رەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت: گـوێ بیسـتی پێغەمبـەری خـوا بـووم (ﷺ) دەیفـەرموو: ((سـوێندبێت بەپـەروەردگار من لـەرۆژێکدا زیـاد لەحـەفتاجار داوای لێخۆشبوون دەکەم لەپەروەردگارم)).

---

[8] تەفسیری ئاسان: ٥١ . ٥٢.

[9] تەفسیری ئاسان: ٦٠٣.

[10] رواه البخاري والترمذي.

٢ ـ وَعَنْ الأعَز المُزَنِي (ﷺ) قَال: قَال رَسُول الله (ﷺ): ((انَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي حَتَى أسْتَغْفِرُ اللهَ فِي اليَومِ مِائَةَ مَرَةٍ))[11]

واتە: (اعز)ی (مزنی) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە، دەفەرموێت: ((هەندێك جار دڵم پەردەیەك دەگێڕێت بەسەریدا هەتا سەدجار داوای لێخۆشبوون دەكەم ئەوجا ئەو پەردەیە هەڵدەگیرێت)).

٣ ـ وَعَنْ ابنُ عُمَر (ﷺ)قَالَ: كَنَّا نَعدُ لِرَسُولِ الله (ﷺ) فِي المَجْلِسِ الوَاحِدِ مَائَةَ مَرَة: ((رَبِّ اغْفِر لِي وَتُبْ عَلَيَّ انَّكَ أنْتَ التَوابُ الرَّحِيم))[12].

واتە: (ابن عمر) ـ ڕەزای خوایان لێبێت ـ دەفەرموێت: جاری وا هەبوو لەیەك كۆڕو دانیشتنی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) سەد جار دەیفەرموو: (پەروەردگارا؛ لێم ببورەو بم بەخشە چونكە هەر تۆ لێخۆشبووی بەسۆزو میهرەبانیت)).

٤ ـ وَعَنْ أبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُول الله (ﷺ): ((وَالذي نَفسِي بِيَدِه لَو لَمْ تَذْنَبُوا لَذَهَبَ اللهَ تَعَالَى بِكُمْ وَلَجَاءَ بِقَومِ يُذْنِبُونَ فَيَستَغْفِرُونَ الله تَعَالَى فَيَغْفِرَ لَهُم))[13].

---

[11] اخرجه مسلم وأبوداود.

[12] رواه أبوداود والترمذي وقال: حديث حسن صحيح.

[13] رواه مسلم.

واتە: (ابی هریرە) -رەزای خوای لێبێت - لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ، دەفەرموێت: ((سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە گەر گوناهو تاوان نەکەن ئەوا خوای گەورە لەناوتان دەبات و گرۆو کۆمەڵێکی دی دەهێنێت گوناهو تاوان بکەن و ، دواتر داوای لێخۆشبوون بکەن و پەروەردگاریش لێیان ببورێت)).

٥ - عَنْ ابِي بَكرِ الصديقِ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : ((مَا أصَرَّ مَنْ اسْتَغْفَرَ فِي اليَومِ سَبْعِينَ مَرَّةً))[١٤].

واتە: (ابی بکر)ی (صدیق) - رەزای خوای لێبێت - لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((چەند سوورو داکۆکیکارە ئەوەی لەرۆژێکدا حەفتا جار داوای لێخۆشبوون دەکات لەپەروەردگارەکەی)).

٦ - وَعَنْ ابِي هُرَيرَةَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: ((أنَّ العَبْدَ اذا أخطأ خَطِيئَةً نَكَتَتْ فِي قَلْبِه نَكْتَةً فَأنْ هُوَ جَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ صَقلَتْ فَأنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَى تَعْلُو قَلبُهُ فَذَلكَ الرَّان الذي ذَكَرَ اللهُ تَعَالَى:﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[١٥].

واتە: (ابی هریرە) - رەزای خوای لێبێت - لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((هەرکاتێك بەندەیەك

---

[١٤] اخرجه ابوداود والترمذي.

[١٥] اخرجه الترمذي وقال حسن صحيح والنسائي وغيرهما.

گونـاهو تـاوانێکی ئـەنجامدا خـاڵێکی ڕەش لەسـەر دڵـی دروسـت دەبێـت ؛ خۆئەگـەر ڕاچڵـەکیو خـێرا داوای لێخۆشبوونی کرد ئەوا پاكو بێگـەرد دەبێـت ، بـەلاّم ئەگـەر گەڕایەوە سەری بەردەوام خاڵـە ڕەشـەکە زیاد دەکاتو هـەتا دڵـی دەتەنێتـەوەو پەردەیـەکی یەکپارچـەیی ڕەش دڵـی دادەپۆشێت ، ئەمەش بە(ران) ناوزەدکراوە لـەقورئاندا کاتێ پـەروەردگار دەفـەرموێت: (نـەخێر ، وانییـە (ئـەو نەفامانـە تێناگـەنو داناچڵـەکێن) بـەڵکو دڵیان ژەنگی هێنـاوەو چڵکـی گونـاه دایپۆشـیوە لەسـەرەنجامی ئـەوکارو کردەوانـەی کەدەیانکرد)) [١٦].

٧ ـ وَعَـنْ أنَـس (ﷺ) قَـالَ: قَـالَ سَـمِعْتُ رَسُـولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: ((قَالَ اللهُ تَعَالَى يَا ابْنَ ادم انَّكَ مَا دَعَوْتَنِي وَرَجَوْتَنِي غَفَرْتُ لَكَ مَاكانَ مِنْكَ وَلاَ أُبَالِي ، يَا ابْنَ ادَم لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنَانَ السَمَاءِ ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي غَفَرْتُ لَكَ ، يَا ابْنَ ادَم لَوْ اَتَيْتَنِي بِقُرَابِ الأَرْضِ خَطَايَا ثُمَّ اَتَيْتَنِي لاَ تُشْرِكُ بِي شَيْئًا لأتَيْتُكَ بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً)) [١٧].

واتـە: (انـس) ـ ڕەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت : گوێبیستی پێغەمبەری خوا بـووم دەیفـەرموو: پـەروەردگار دەفـەرموێت: ئـەی نـەوەی ئادەم هـەر کـاتێك نزاودوعـاو

---

[١٦] تەفسیری ئاسان: ٥٨٨.

[١٧] رواه الترمذي وقال حديث حسن .

خوازیاربیت ئەوا لەسەرجەم گوناهو تاوانەکانت دەبـوورمو باکم نییە، ئەی نەوەی ئادەم گەر گوناهەکانت بەئەندازەی گەواڵەهـەورەکانی ئاسمـان بێـتو ئەمپەڕاوپـەڕی گرتبێـت بەمەرجێك داوای لێخۆشبوونم لیٚ بکەی لێت دەبوورم ، ئەی نەوەی ئادەم گەر بەئەندازەی خۆڵو خاکی سەرزەوی گوناه بکەیتو بەوحاڵەوە بگەڕێیتـەوە لام بەرمـەرجێك هـاوەڵم بـۆ پـەیدا نەکەیت ئەوا بەوئەندازەیە لێخۆشبوونت بۆ دەخەمـە گەڕو ئامێزی میهرو سۆزت بۆ والاّ دەکەم)).

٨ ـ وَعَنْ عَبْدُاللهَ بنُ عَباسٍ (ﷺ)قَالَ: ((مَنْ لَزِمَ الأسْتغفَارَ جَعَلَ لَهُ مِنْ كُلِّ هَمٍ فَرَجَاً ، وَمِنْ كُلِّ ضِيقٍ مَخْرَجَاً ، وَرَزَقَهُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَحْتَسِبُ))[١٨].

واتە: (عبدالله)ی کوڕی (عباس) ـرەزای خوایان لێبێت ـ دەفـەرموێت: ((ئـەوەی پەیوەسـتی لێخۆشـبوون بێـت پـەروەردگار لەهـەموو غـەمو پـەژارەو ئاسـتەنگو گرفتێـك قوتـاری دەکـاتو لەلایەکـەوە رزقو رۆزیو بژێـوی دەدات خۆی هەرگیز پەی پێیی نەبردبێت)).

٩ ـ عَنْ عَبْدُالله بنُ بَشِيرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) : ((طُوبَى لِمَنْ وَجَدَ فِي صَحِيفَتِه اسْتِغْفَاراً كَثِيراً))[١٩].

---

[١٨] رواه ابوداود والنسائي وابن ماجه والحاكم وقال: صحيح الاسناد.

[١٩] رواه النووي في سنن ابن ماجه باسناد جيد.

واتە: (عبدالله)ی کوڕی (بشیر) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((خۆشحاڵی بۆ ئەوەی لەنامەی کردارو ڕەفتارەکانیدا داوای لێخۆشبوون و بێوەیی زۆر بەدی دەکات)).

## دەستەواژەو چۆنیەتی داوای لێخۆشبوون

١ ـ عَنْ ثَوْبَان (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) اذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلَاتِه اسْتَغْفِرِ اللهَ ثَلَاثًا وَقَالَ: ((اللهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ وَمِنْكَ السَّلَامُ تَبَارَكْتَ يَاذَا الجَلَالِ وَالأكرام)). قِيلَ للأوزاعي وَهُوَ أَحَدُ رُوَاتِه كَيْفَ الأسْتغفارِ ؟ قَالَ: يَقُولُ: أَسْتَغْفِرُ اللهَ ، أَسْتَغْفِرُ اللهَ))[٢٠].

واتە: (ثوبان) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: هەرکاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنوێژ تەواو ببوایە سێجار داوای لێخۆشبوونی دەکردو دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ تۆ خۆت ئاشتیو سەرچاوەکەیتی، بەرزو پیرۆزو بالأبیت ئەی خاوەن شکۆمەندو ڕێزداریی)). (اوزاعی)یش یەکێکە لەفەرموودە گێڕەرەوەکان لێیان پرسی: چۆن داوای لێخۆشبوون بکەین؟ فەرمووی بڵێن: پەروەردگارا لێم ببورە.. پەروەردگارا لێم ببورە )).

---

[٢٠] رواه مسلم.

٢ ـ وَعَنْ عَائشَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُكْثِرُ انْ يَقُولَ قَبْلَ مَوْتِـهِ : ((سُبْحَانَ اللهَ وَبِحَمْدِهِ اسْتَغْفِرِ اللهَ وَأتُوبُ الَيهِ))[٢١].

واتـه: خـاتوو (عائشـه) ی دایکـی موسـوڵمانان ــ رەزای خـوای لێبێـت ــ دەفـەرموێت: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـەر لەوادەی کۆچی دوایی بەبەردەوامی دەیفەرموو: ((بێگەردیو پـاکیو سـوپاسو سـتایش بـۆ پـەروردگارەو داوای لێخۆشبوونو گیرابوونی تەوبەی لێدەکەم)).

٣ ـ وَعَنْ ابنُ مَسْعُودِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) مَنْ قَالَ: ((اسْتَغْفِرِ اللهَ الذي لاَ الـهَ الاَّ هُـوَ الحَـيُّ القَيُـومُ وَأتُـوبُ اليهِ)) غُفِرَتْ ذُنُوبُهُ وَانْ كَانَ قَدْ فَرَّ منْ الزَحْفِ))[٢٢].

واتـه: (ابن مسعود) ـرەزای خوای لێبێت . لەپێغەمبـەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ئەوەی بڵێت: ((داوای لێخۆشـبوون دەکـەم لەپـەروەردگاری تـاکو تـەنیاو زینـدو ڕێکخەری کاروباری بەندەکانو تەوبەشم هەر بۆلای ئەوە ، ئـەوا خـوای گـەورە لـەگوناهو تاوانـەکانی دەبوورێـت گـەر لەمەیدانی جەنگو غەزاشدا هەڵهاتبێت)).

[٢١] متفق عليه.

[٢٢] رواه ابوداود والترمذي والحاكم وقال حديـث صحيح علـى شـرط البخاري ومسلم.

٤ ـ وَعَنْ ابنِ عُمَر (ﷺ)قَال: كُنَّا نَعُدُّ لرَسُولِ الله(ﷺ) فِي المَجْلسْ الوَاحد مائَةَ مَرَّةٍ : ((رَبِّ اغفرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ انَّكَ انْتَ التَّوابُ الرَّحِيم))[٢٣].

واتە: (ابن عمر) ـ رەزای خوایان لێبێت ـ دەفەرموێت: لەكۆڕو دانیشتنی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) سەد جار دەیفەرموو: ((پەروەردگارا؛ بمبەخشەو لێم ببورە بەڕاستی هەرتۆی لێخۆشبووی بەسۆزو میهرو بەزەیی)).

## شانزای لێخۆشبوون

٥ـ عَنْ شَدَادَ بن اوسٍ (ﷺ) عَنِ النَبيَّ قَالَ: ((سَيد الأسْتغْفَار انْ يَقُولَ العَبْد ((اللهُمَّ انْتَ ربِي لاَ الهَ الاّ انْتَ خَلَقْتَنِي وَانَا عَبْدُكَ ، وَانَا عَلَى عَهْدكَ وَوَعْدكَ مَا استَطَتُ ، اعُوذُبِكَ منْ شَرِ مَا صَنَعْتُ ، أبُوءُ لَكَ بِنعْمَتَكَ عَلَيَّ، وَابُوءُ بِذَنْبِي فَاغْفرلِي فانَّهُ لاَ يَغْفرُ الذنُوبَ الاَّ انْتَ)) مَنْ قَالَها بالنَهَار مُوقنَاً بِهَا فَمَاتَ مِنْ يَوْمه قَبْلَ انْ يَمْسِي فَهُوَ مِنْ اهلِ الجَنَّة وَمَنْ قَالَها منَ الليلِ وَهُوَ مُوقن بِهَا فَمَاتَ قَبْلَ أن يُصْبِحَ فَهُوَ مِنْ اهْلِ الجَنَّة))[٢٤].

واتە: (شداد)ی كوڕی (اوس) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت:

---

[٢٣] رواه أبوداود والترمذي وقال حديث حسن صحيح.

[٢٤] رواه البخاري.

((شانزای لێخۆشبوون ئەوەیە بەندە بڵێت: ((پەروەردگارا؛ تۆی پەروەردگاری من‌و تاك‌و تەنیایت‌و منیش بەندەی تۆم، خوایەگیان پابەندم لەسەر پەیمان‌و بەڵێنی خۆم هەتا بتوانم‌و، پەنات پێدەگرم لەشەڕو خراپەی رەفتارم‌و دانیش دەنێم بەنازو نیعمەتەكانی تۆدا هاوكات لەگەڵ دان نانم بەگوناهو تاوانەكانم ، خوایەگیان دەلێم ببورە چونكە بەتەنیا هەر تۆی لێخۆشبووی گوناهو تاوان)) ئەوەی لەرۆژ یان شەودا بەدڵنیاییەوە بیخوێنێت‌و لەرۆژ یان شەودا مەرگ یەخەی پێ بگرێت ئەوا ئێوارەكەی یان بەیانیەكەی لەریزی بەهەشتیەكان ناوزەد دەكرێت)).

# بەشی حەوتەم

سڵاواتدان لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ)

پێویستی سڵاواتدان لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی ناوبردنیدا لەکۆڕو دانیشتنەکاندا.

ئەجرو پاداشتی سڵاواتدان لەدیاری پێغەمبەر(ﷺ)

دەستەواژەی سڵاواتدان لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ)

## سلاَواتدان لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ)

١ ـ پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيماً﴾ [(الأحزاب:٥٦)].

واتە: ((بەڕاستی خواو فریشتەکانی سلاَوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر (ﷺ)، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئێوەش سەلامو سلاَواتی لەسەر بدەن (بەردەوام یادی خێری بکەن))[1].

٢ ـ وَعَنْ فَضَالَةَ بنُ عُبَيد (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) رَجُلاً يَدْعُو فِي صَلاَتِهِ لَمْ يُمَجِدِ اللهَ تَعَالَى وَلَمْ يُصَلِّ عَلَى النَبيِّ (ﷺ) فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : ((عَجِّلَ هَذَا)) ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ لَهُ: ـ أوْ لِغَيْرِهِ ـ ((اذَا صَلَّى احَدُكُمْ فَلْيَبْدأ بِتَحْمِيدِ رَبِّهِ سُبْحَانَهُ والثَنَاءُ عَلَيهِ ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَبيِّ (ﷺ) ثُمَّ يَدْعُو بَعْدُ بِمَا شَاءَ))[2].

واتە: (فضالة) ی کوڕی (عبيد) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێبیستی پیاوێك بوو لەنوێژەکەیدا پەروەردگاری بەبەرزو بالاَ ڕانەگرتو

---

[1] تەفسیری ئاسان: ٤٢٦.

[2] رواه ابوداود والترمذي وقالا حديث صحيح.

سلاٌواتيشـى نـەدا لـەديارى پيٌغەمبـەر (ﷺ)؛ هـەر بۆيـە پيٌغەمبەرى خوا(ﷺ) فەرمووى: ئەو پياوە پەلەيكرد)) پاشان بـانگى كـردو پيٌـى وت: ــ يـان بـەوانى ديكـەى وت ــ: ((هەركاتيٌك يەكيٌكتان نويٌژى كرد با بەسوپاس و ستايشـى پەروەردگارەكەى دەست پىٌ بكاتو ، ئنجـا سـلاٌوات بـدات لەديارى پيٌغەمبـەرو دواتريـش هـەرنزاو دوعايـەكى ديكـەى كرد سەربەستو ئازادە)).

٣ ـ وَعَنْ عُمَرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) : ((الدُّعَـاء مَوقُوفٌ بَيْنَ السَمَاءِ وَالأَرْضِ لاَ يَصْعُدُ حَتَى يُصَلِي عَلَيَّ فَلاَ تَجْعَلُونِـي كَقَـدَحِ الرَّاكِـبِ صَلُّـوا عَلَـيَّ أوَّلَ الدُّعَـاء وَوَسَـطَهُ وَاخِرَهُ))[٢].

واتە: (عمر) ـ رەزاى خواى ليٌبيٌت ـ لەپيٌغەمبـەرى خواوە (ﷺ) دەگيٌريٌتەوە؛ دەفەرمويٌت: نزاو دوعا لەنيٌوان ئاسمـانو زەويـدا رادەوەسـتيٌتو بەرزنابيٌتـەوە هـەتا سـلاٌوات نـەدا لـەديارى منو، بەچەشنى ئەو قامچييەم لىٌمەكەن بەدەستـى سـوارچاكەوەيەو هـەتا بەئەسپەكەيدا نەكيٌشـىٌ ناكەويٌتـە بزاوتو رۆيشتن ، بۆيـە لەسـەرەتاو ناوەڕاستو دوايـى نزاو دوعادا سلاٌوات بدەن لەديارم)).

٤ ـ وَعَنْ أوسِي بنُ أوسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رسُولُ الله (ﷺ) : اِنَّ أفْضَلَ أيَّامِكُمْ يَوْمُ الجُمْعَةِ فَأكْثِرُوا عَلَيَّ الصَلاَةَ فِيهِ ، فَأنَّ

---

[٢] اخرجه الترمذي موقوفاً على عمرو ورفعه رزين.

صَلاَتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ ، قَالُوا يَا رَسُولَ الله وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلاَتَنَا عَلَيْكَ وَقَدْ اَرَمْتَ ـ اي صرت رمماً ـ قَالَ يَقُولُ بَلَيْتُ قَالَ: اِنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ اَجْسَادَ الأَنْبِيَاءِ))[٤].

واتە: (اوس)ی کوڕی ( اوس) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ، دەفەرموێت: (باشترین ڕۆژتان ڕۆژانی هەینی‌یە ، بۆیە داواخوازم پتر سڵاوات بدەن لەدیارمو، لەوڕۆژەدا سڵاواتەکانتان دەخرێتە ڕوو و بەدی دەکەم)) یارانیش پرسیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاخۆ چۆن سڵاواتی ئێمە بەدی دەکەیت لەکاتێکدا جەستەی تۆ لەژێر خاکدایەو دەبیت بەخاکو خۆڵ ؟! پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: پەروەردگار یاساغی کردووە زەوی جەستەو لاشەی پێغەمبەران بڕزێنی‌و تیابەرێت)).

٥ ـ وَعَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ الله(ﷺ) : ((لاَ تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيْداً وَصَلُّوا عَلَيَّ فَأَنَّ صَلاَتَكُم تُبَلِّغُنِي حَيْثُ كُنْتُم))[٥].

واتە: (ابی هریرە) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: گۆڕەکەم مەکەن بەمەنزڵی سەفاو سەیرانو شادیی‌و ماتەمینی جەژنانە بەڵکو

---

[٤] رواه ابوداود باسناد صحيح.

[٥] رواه ابوداود باسناد صحيح.

# ئەجرو پاداشتی سڵاواتدان لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ)

١ ـ عَنْ عَبْدُاللهَ بنُ عَمْروِ بنِ العَاص (رضي الله عنه) أنَّهُ سَمِعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ : ((مَنْ صَلّى عَلَيَّ صَلاَةٍ صَلّى اللهُ عَلَيهِ بِهَا عَشْرَاً))[١٠].

واتە: (عبداللە)ی کوڕی (عمرو) ی کوڕی (عاص) ڕەزای خوایان لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((ئەوەی سەڵاواتێك بدات لەدیارم پەروەردگار لەبەرامبەردا دە سڵاوات دەدات لەسەری)).

٢ ـ عَنْ ابنِ مَسْعُود (رضي الله عنه) انَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: ((أوْلَى النَّاس بِي يَومَ القِيَامَةِ أكثَرُهُم صَلاَةً))[١١].

واتە: (ابن مسعود) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((نزیکترین کەسێك لەمنەوە بەوەی شەفاعەتی بۆ بکەمو لەکۆڕو دانیشتنی منەوە نزیك بێت ئەوەیە پتر سڵاوات بدات لەدیارم)).

٣ ـ عَنْ أبِي طَلْحَةَ الأَنْصَارِي قَالَ: أصْبَحَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَوْمَاً طَيِبَ النَفسِ يُرَى فِي وَجْهِهِ البُشْرَ)) قَالُوا يَارَسُولَ اللهِ

---

[١٠] رواه مسلم.

[١١] قال الترمذي حديث حسن.

اصْبَحْتَ اليَومَ طَيبَ النَفْسِ يَرى فِي وَجْهكَ البِشْـرَ ، قَـالَ: ((اجَل أتَانِي اتٍ مِنْ رَبي عَزوَجَل فَقَالَ: مَنْ صَلّـى عَلَيْكَ مِنْ امُتِكَ وَرَفَعَ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ وَرَدَّ عَلَيهِ مِثْلَهَا))[١٢].

واته: (ابی طلحة)ی (انصاری) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڕوویەکی گەش و شادەوە بەدەرکەوت و یارانیش پرسیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمڕۆ ڕووگەش و شاد بەدەر دەکەویت، فەرمووی: بەڵێ؛ پەیامبەری پەروەردگارم پێی ڕاگەیاندم: ئەوەی لەنەتەوەکەت سڵاوێك بدات لەدیارت پەروەردگار دە چاکەی بۆ تۆماردەکات و دە خراپەشی دەسڕێتەوەو دە پلەش بەرزو بڵندی دەکات و هاوچەشنی سڵاوەتەکەشی وەڵام دەدرێتەوە)).

٤ ـ وَعَنْ عَبْدالرَّحمَن بنُ عَوْفٍ (ﷺ) قَالَ: اتَيْتُ النَبيَّ (ﷺ) وَهُوَ سَاجِدٌ ، فَأطَالَ السجُودَ ، قَالَ: ((أتَانِي جِبْرِيلَ قَالَ: مَنْ صَلَى عَلَيْكَ صَلى اللهُ عَلَيْهِ ، وَمَنْ سَلمَ عَلَيْكَ سَلمتُ عَلَيْهِ ، فَسَجَدْتُ للهِ شُكْراً ))[١٣].

واته: (عبدالرحمن)ی کوڕی (عوف)ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت : هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و

---

[١٢] رواه الامام أحمد وقال ابن كثير وهذا اسناد جيد.

[١٣] رواه أحمد والحاكم وقال صحيح الاسناد وقال الشيخ الالباني حديث صحيح لطرقه وشواهده.

لەکڕنووشـــدابوو، زۆری خایـــاندو پاشـــان فـــەرمووی: ((جوبرەئیل هاتو وتـی: ئـەوەی سلاّواتێك بدات لـەدیارت سلاّواتێك دەدەم لەسەری‌و ئەوەشی سلاّوت لێ بکات سلاّوی لێدەکەم، منیش لەشوکرو سوپاسی پەروەردگاردا کڕنووشم برد)).

٥ ـ وَعَنْ عَبْدُالله بنُ عَمْرو قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) : ((مَنْ صَلَى عَلَيَّ أوْ سَألَ لِي الوَسِيلَةَ حقَتْ عَلَيهِ شَفَاعَتِي يَوم القِيَامَةِ))[١٤].

واتە: (عبدالله)ی کوڕی (عمرو) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی سلاّوات بدا لەدیارم یان داواخوازی پلەوپایەی تایبەت بێت بۆم بێگومان شەفاعەتم مسۆگەر دەکات لەڕۆژی قیامەتدا)).

٦ ـ وَعَنْ أبِي الدَرْدَاءَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُول الله (ﷺ) : ((مَنْ صَلَى عَلَيَّ حِينَ يُصْبِحُ عَشْراً وَحِينَ يُمْسِي عَشْراً أدْرَكَتْهُ شَفَاعَتِي يَومَ القِيَامَةِ))[١٥].

واتە: (ابی الدرداء) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفـەرموێت: ((ئـەوەی بـەیانیان‌و ئێـواران دە سـلاّوات بـدات لـەدیارم ئـەوا شـەفاعەتم فریـای دەکەوێت لەڕۆژی قیامەتدا)).

---

[١٤] قال الشيخ الالباني الحديث صحيح.

[١٥] رواه الطبراني.

# دەستەواژەکانی سڵاواتدان لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ)

١ ـ عَنْ أبِي مُحَمَدٍ كَعْبُ بنُ عَجْرَةَ (ﷺ) قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا النَبيُّ (ﷺ) فَقُلْنَا : يَا رَسُولَ الله قَدْ عَلمْنَا كَيْفَ نُسَلم عَلَيْك فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: قُولُوا: ((اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَدٍ وَعَلَى ال مُحَمَدٍ كَمَا صَلَيْتَ عَلَى ابْرَاهِيم وَال ابْرَاهِيم انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ؛ اللهُمَّ بَارِك عَلَى مُحَمَدٍ وَعَلَى ال مُحَمَدٍ كَمَا بَارَكت عَلَى ال ابْرَاهِيم انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ))[١٦].

واتە: ابی محمد (کعب)ی کوڕی (عجرە) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لامانو ئێمەش وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەزانین چۆن سەلامت لێبکەین ، بەڵام دەمانەوێت بزانین بەچ شێوەیەك سڵاوات بدەیت لەدیارت؟ فەرمووی بڵێن: پەروەردگارا؛ سڵاوات بدە لە(محمد)و خاوخێزانی بەچەشنی سڵاوات دانت لە(ابراهیم)و خاوخێزانی؛ بەڕاستی هەر تۆی بەسۆزو پایەدارو ڕێزداری شکۆمەند، پەروەردگارا؛ فەڕو چاکە دابارێنە بەسەر (محمد)و خاوخێزانیدا بەچەشنی دابارینی

[١٦] متفق علیه.

فەرو چاكە بەسەر (ابراهيم)و خاوخێزانی‌دا بەڕاستی تۆی بەسۆزو پایەدارو ڕێزداری شكۆمەند)).

٢ - وعَنْ أبِي حَمَيدٍ السَاعدِيِّ (ﷺ) : قَالُوا يَا رَسُولَ الله كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْك ؟ قال: ((قُولُوا: اللَهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى أزوَاجِهِ وَذُرِيَتِه كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى اِبْرَاهِيم وَبَارك عَلَى مُحَمَدٍ وَعَلَى أزوَاجِهِ وَذُرِيتِهِ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى اِبْرَاهِيمَ اِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ))[١٧].

واتە: (ابی سعید) ی (ساعدی) - ڕەزای خوای لێبێت - دەفەرموێت: یاران پرسیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن سلاوات بدەین لەدیارت؟ فەرمووی بلێن: پەروەردگارا؛ سلاوات بدە لەدیاری محمدو خێزانو وەچەكانی بەچەشنی سلاوات دان لەدیاری (ابراهیم)و فەرو پتریی‌و پیرۆزی دابارێنە بۆسەر محمدو خێزانو وەچەكانی بەچەشنی فەرو پتریی‌و پیرۆزیی بۆ (ابراهیم)؛ بەڕاستی هەر تۆ بەسۆزو پایەدارو ڕێزداری شكۆمەندی)).

٣ - وعَنْ أبِي مَسْعُودٍ البَدْرِي (ﷺ) قَالَ اَتَانَا رَسُولُ الله (ﷺ) وَنَحْنُ فِي مَجْلِسِ سَعْد بنُ عَبَادةَ (ﷺ) فَقَالَ لَهُ بَشِيرُ بنُ سَعْد أمَرَنَا الله اَنْ نُصَلِّي عَلَيْكَ يَا رَسُولَ الله (ﷺ) فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ فَسَكَتَ رَسُولُ الله (ﷺ) حَتَى تَمَنَيْنَا اَنَّهُ لَمْ يَسْأَلُهُ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): ((قُولُوا : اللهُمَّ صَلِ عَلَى مُحَمَدٍ

---

[١٧] متفق عليه.

وَعَلَى الِ مُحَمَدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى ابْرَاهِيمَ وَبَارِك عَلَى مُحَمَدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى اِبْرَاهِيمَ انَكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَالسَلاَمُ كَمَا قَدْ عَلِمْتُم))[18].

واتە: ابی مسعود) ی (بدری) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: کۆڕێکمان بەستبوو لەماڵی (سعد)ی کوڕی (عبادە)و پێغەمبەری خوا(ﷺ) هات بۆلامان و (بشیر)ی کوڕی (سعد)وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەروەردگارمان فەرمانی پێداوین سلاوات بدەین لەدیارت چۆن سلاوات بدەین لەدیارت؟ پێغەمبەری خواش(ﷺ) بێدەنگ بوو بەچەشنێ خوازیاربووین (بشیر) ئەو پرسیارەی لێنەکردایە، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بلێن: پەروەردگارا؛ سلاوات بدە لەدیاری (محمد)و خاوخێزانی بەچەشنی سلاوات لەدیاری (ابراهیم)و، پیرۆزو فەرو پتریی بکە (محمد)و خاوخێزانی بەچەشنی پیرۆزو پتریی و فەرداری (ابراهیم) بەڕاستی هەر تۆ بەسۆزو پایەدارو ڕێزدارو شکۆمەندی)).

٤ ـ وَعَنْ عَبْدُاللهِ بنُ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: اذَا صَلَّيْتُمْ عَلَى رَسُول اللهِ(ﷺ) فَأحْسِنُوا الصَلاَةَ فَانَّكُم لاَ تَدْرِي لَعلَ ذلك يُعْرَضَ عَلَيه قَالُوا لَهُ فَعَلِّمنا قَال ، قُولُوا: ((اللهُمَّ اجعَل صَلَوَاتُكَ وَرَحْمَتُكَ وَبَرَكَاتُكَ عَلَى سَيد المرْسَلِين ، وَامَامَ المُتَقِين ، وَخَاتَم النَبِيين مُحَمَدٍ عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ وَ امَامَ الخَيْر ،

---

[18] رواه مسلم.

وَقَائِدَ الخَيْرِ ، وَرَسُولِ الرَّحْمَةِ . اللهُمَّ ابْعَثْهُ مَقَاماً يَغْبِطُهُ بِهِ الأَوَّلُون، اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَآلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ. اللهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَآلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ))[19].

واته: (عبدالله)ی کوڕی (مسعود) - ڕەزای خوای لێبێت - دەفەرموێت: کاتێك سڵاواتتاندا لەدیاری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەجوانترین شێواز بیخەنە ڕوو چونکە دەگونجێت ڕاستەوخۆ بەدی بکات و بۆی بخرێتە ڕوو، ئامادەبووانیش پرسیان: بەڵکو فێرمان بکەیت چۆن سڵاوات بدەین لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ)؟ فەرمووی بڵێن: پەروەردگارا؛ سڵاوات و بەزەیی و فەڕو پیرۆزیت ببارێنە بەسەر گەورەو سەرداری پێغەمبەران و پێشەوای خواناسان و کۆتا و دوا ڕشتەی پێغەمبەرایەتی (محمد)ی بەندەو پێغەمبەرت کەوا پێشەواو پێشەنگی خێروچاکەو سۆزو بەزەیی یە. پەروەردگارا؛ پلەوپایەیەکی پێببەخشە پێشینەکانی یەکەم سەریان سوڕبمێنێت و دڵیان بێتەوە یەك ، پەروەردگارا؛ سڵاوات بدە لە (محمد)و خاوخێزانی بەچەشنی سڵاوات لە(ابراهیم) و خاوخێزانی بەڕاستی هەر تۆ بەسۆزو پایەدارو ڕێزدارو شکۆمەندی، پەروەردگارا؛ فەڕو پیرۆزیو پتریی داببارێنە

---

[19] رواه ابن ماجه.

بەســـەر (محمـــد)و خـــاوخێزانی بەچەشـــنی فـــەڕو پیرۆزداریکردنی (ابراهیـم)و خـاوخێزانی بەڕاسـتی هـەر تـۆ بەسۆزو پایەدارو ڕێزداری شکۆمەندی)).

٥ ـ وعَنْ عُقْبَةَ بنُ عمرو (ﷺ) قَالَ ، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : أَتَى رَسُولَ اللهِ رَجُلٌ حَتَى جَلَسَ بَيْنَ يَدَيهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ: أمَّا السَلاَمُ عَلَيْكَ فَقَد عَرِفْنَاهُ ، وَأما الصَلاَةَ فَاخبِرْنَا بِهَا كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ ؟ قَالَ: فَصَمَتَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حَتَى وَدِدنَا انَّ الرَجُلَ الذي سَألَهُ لَمْ يَسْألَهُ ثُمَّ قَالَ: ((اذَا صَلَّيْتُم عَليَّ فَقُولُوا: [اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَدٍ النَبِيِّ الأُمِيِّ وَعَلَى الِ مُحَمَدٍ ، كَمَا صَلَيْتَ عَلَى اِبرَاهِيمِ وَالِ اِبْرَاهِيمِ وَبَارِك عَلَى مُحَمَدٍ النَبِيِّ الأمِي ، وَعَلَى الِ مُحَمَدٍ ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى اِبْرَاهِيمِ وَعَلَى الِ اِبْرَاهِيمِ اِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ))[٢٠].

وات: (عقبـه)ی کـوڕی (عمـرو) ـ ڕەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت: پیـاوێك هـات بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـواو لەبەردەمیدا دانیشت و پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا دەزانین چۆن سەلامت لێ بکەین بەلاَم چۆنیەتی سلاَواتدانمان فێربکە هـەتا سـلاَوات بدەیـن لـەدیارت، پێغەمبـەری خـواش(ﷺ) بەئەندازەیەك بێدەنگ بوو خوازیاربووین ئەوپیاوە پرسیاری

---

[٢٠] قال الالباني في هامش (فضل الصلاة على النبي) اسناده حسن وبه اخرجه ابوداود في سننه وابن ابي شيبة وابن حبان والدارقطني في سننه والحاكم والبيهقي وقال الحاكم صحيح على شرط مسلم ووافقه الذهبي.

لێنەکردایە، پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەردەی بێدەنگی شکاندو فەرمووی: کاتێك سلاَواتتاندا لەدیارم بلێن: پەروەردگارا؛ سلاَوات بدە لەدیاری (محمد)ی پێغەمبەری نەخوێندەوارو خاوخێزانی بەچەشنی داباری‌نی سلاَوات لەدیاری (ابراهیم)و خاوخێزانی، فەڕو پیرۆزیو پتریش بخە لە(محمد)ی پێغەمبەری نەخوێندەوارو خاوخێزانی بەچەشنی فەڕو پیرۆزداری کەوتن لە(ابراهیم)و خاوخێزانی بەڕاستی هەر تۆی بەسۆزو پایەدارو ڕێزداری شکۆمەندی)).

# چەند سوودێك

١ ــ لەسەرجەم دەستەواژەكانی پێشووی سڵاواتدان لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ) دەتوانین بگەین بەم دەستەواژەیەی خوارەوە: ((اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى اِبْرَاهِيمَ وَعَلَى الِ اِبْرَاهِيمَ اِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ، اللهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى اِبْرَاهِيمَ وَعَلَى الِ اِبْرَاهِيمَ فِي العَالَمِينَ اِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).

واتە: ((پەروەردگارا؛ سڵاوات بدە لەدیاری (محمد)و خاوخێزانی بەچەشنی سڵاواتدان لەدیاری (ابراهیم)و خاوخێزانی بەڕاستی هەر تۆی بەسۆزو پایەدارو ڕێزداری شكۆمەندی . پەروەردگارا؛ فەڕو پیرۆزیو پتریی بخە لە(محمد)و خاوخێزانی بەچەشنی دابارینی فەڕو پیرۆزی لەسەر (ابراهیم)و خاوخێزانی ، بەڕاستی هەر تۆی بەسۆزو پایەدارو ڕێزدارو شكۆمەندی)).

٢ ـ واتای سڵاواتدان لەدیاری پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەیە:

(ا) سڵاواتدانی پەروەردگار لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ): ستایش كردنیەتی لەلایەن فریشتەكانەوەو داوای لێخۆشبوونە بۆی.

(ب) سڵاواتدانی فریشتەكان لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ) بەدوعاو داوای لێخۆشبوون كردن بۆی .

(ج) سڵاواتدانی بەندەکان لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ): بریتیە لــەدوعاو داوا لەپــەروەردگار بەستایشــکردنی لەلایــەن فریشتەکانەوەو داوای سۆزو میهرو لێخۆشبوون بۆی.

# بەشی هەشتەم

# ویردو زیکری بەیانیان و ئێواران

# (المأثورات)

أعُوذُ باللّه السَميع العَليم مِنَ الشَيْطَان الرَّجيم [1].

واتە: ((پەنا دەگرم بەخوای بیسەرو زانا لەشەیتانی نەفرین لێکراو)).

﴿بسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ [2] ، الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ، الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ، إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ، اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ، صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾ [3] [(الفاتحه:١. ٧)].

---

[1] پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ [(النحل:٩٨)] واتە: ((ئینجا کاتێك قورئانت خوێندو دەورتکردەوە، ئەوە پەنابگرە بەخوا لەشەیتانی نەفرین لێکراو)) [(تەفسیری ئاسان: ٢٧٨)] ، (ابن السنی) لە(انس)ەوە ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕێتەوە: دەفەرموێت: پەنابگرێت بەپەروەردگار لەشەیتانی نەفرین لێکراو ئەوا پەروەردگار پەنای دەدات هەتا رۆژدەکاتەوە)).

[2] (ابوداود)و ئەوانی دی بە(سند)ێك لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕنەوە ؛ دەفەرموێت:هەر ئیش وکارێکی گرنگ بەناوی خوا دەست پێنەکات بێ فەڕو بێرە)).

[3] (ابی)ی کوڕی (کعب) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: سوێنبێت بەوەی گیانی منی بەدەستە لەتەورات و ئینجیل و زەبوورو (فرقان)دا هاوچەشن و وێنەی (فاتحە) دانەبەزیووە(فاتحە) حەوت ئایەتەو قورئانی مەزن و پیرۆزیشە پێمان بەخشراوە)) [(رواه الترمذی حدیث حسن صحیح)].

واتە: ((بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبانەوە ، سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایەو بۆ خوایە ، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە، بەخشندەو دلۆڤانە ، کانگای رەحمەت و میهرەبانیە، خاوەن و سەرداری رۆژی پاداشت و سزایە، خوایە؛ تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لەتۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین ، خوایە بەردەوام رێنوومایمان بفەرموو بۆ ئەم رێبازی راست و دروستی ئیسلامە ؛ کەبەرنامەو رێبازی ئەوانەیە لەنازو نیعمەتی خۆت بەهرە وەرت کردوون، نەمانخەیتە سەر رێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە ، هەروەها نەمانخەیتە سەر رێبازی ئەوانەش ، کەسەرگەردان و گومڕان))[٤].

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، ﴿ الم، ذَلِكَ الْكِتَابُ لا رَيْبَ فِيهِ هُدىً لِلْمُتَّقِينَ، الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ، وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ، أُولَئِكَ عَلَى هُدىً مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ [(البقرة: ١ـــ ٥)]

واتە: (بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ، ئەلف ، لام ، میم (ئەم پیتانە بەتەنیا پەروەردگار دەزانێت مانایان چی‌یە)، ئەو قورئانە کتێبێکە هیچ گومانێکی تێدا نییە کەمایەی رێنموویی و سەرچاوەی هیدایەتە بۆ خواناسان و پارێزکاران،

---

[٤] تەفسیری ئاسان: ١.

ئەوانەی باوەڕ بەنەبینراوەکان دەهێنن، هەروەها نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەنو لەو رزق و رۆزییە(حەلاڵەی) پێمان بەخشیوون دەبەخشن، ئەوانە باوەڕ دەهێنن بەو (پەیامەی ، کەبۆ تۆ ئەی محمد (ﷺ) دابەزێنراوەو بەوپەیامانەش کەبۆ (پێغەمبەران)ی پێش تۆ دابەزێنراوە، دڵنیاش دەبن کەرۆژی دوایی پێش دێت ، قیامەت هەر بەرپا دەبێت ، ئائەوانە لەسەر شارێگەی هیدایەتی پەروەردگاریانن‌و هەر ئەوانیش سەرفرازو سەرکەوتوون))[٥].

﴿اللَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلا نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلا يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ، لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ، اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ [(البقرة:٢٥٥ـ ٢٥٧)].

واتە: ((خوازاتێکە جگە ئەو هیچ خوایەکی تر نییە کەشایەنی پەرستن بێت‌و ئەو هەمیشە زیندووەو راگرو سەرپەرشتیاری هەموو دروستکراوەکانیەتی، نە وەنەوز دەیگرێت‌و نەخەو چونکە راگرو سەرپەرشتیاری بوونەوەرە،

---

[٥] تەفسیری ئاسان: ٢.

هەرچی لەئاسمانەکان‌و هەرچی لەزەویدا هەیە هەر ئەو زاتە خاوەنیانە، کێیە ئەوەی دەتوانێت تکا بکات لەلای ئەو، بەبێ مۆڵەتی خۆی، دەشزانێت چی لەئێستاو داهاتوو رابردوودا روویداوەو روودەدات، هیچ کام لەدروستکراوانی زانست‌و زانیاری تەواویان نیە دەربارەی زانیاری‌و زانستەکانی ئەو ، مەگەر بەوەی کەخۆی بیەوێت فێریان بکات کەفەرمانڕەوایی‌و دەسەڵات‌و زانینیی ئەو زاتە هەموو ئاسمانەکان‌و زەوی گرتۆتەوەو پارێزگاریان بەلای خواوە هیچ گران نیەو ماندووی ناکات‌و هەر ئەو خوایەکی بەرزو بڵندو گەورەیە ، بەهیچ جۆرێك زۆرکردن نیە لەوەرگرتنی بیروباوەڕی ئاینی ئیسلامدا، چونکە بەڕاستی رێبازی چاك‌و دروست روون‌و ئاشکرابووەو جیابۆتەوە لەگومڕایی‌و سەرکەشی، جائەوەی باوەڕی نەبێت بە (طاغوت)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتووە بەبەهێزترین هۆکاری رزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە ؛ کەهیچ پسان‌و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نی‌یەو هەمیشە پتەوو دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەرو زانایە، خوا پشت‌و پەناو خاوەنی ئەوکەسانەیە باوەڕیان هێناوە، لەتاریکاییەکانی گومان‌و ستەم دەریان دەهێنێت‌و دەیانبات بەرەو نوورو روونــاکی، ئەوانەش کەرێبازی کوفریان گرتۆتەبەر یارمەتی دەرەکانیان تەنها (طاغوتەکانە) لەنوورو روونـاکی دەریـان دەهێنن‌و بەرەو تاریکاییەکان

دەیانبەن ، ئاەوانە نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشە تیایدا دەمێننەوە))[٦].

﴿لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ، لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلا تُحَمِّلْنَا مَا لا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾[٧]. [(البقرة: ٢٨٤ ـ ٢٨٦)].

واتە: ((هەرچی لەئاسمانەکان و هەرچی لەزەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانەو ئەگەر ئەوەی لەدڵ و دەروونتاندا جێگیربووە، دەری بخەن یان بیشارنەوە خوا دەربارەی لێتان دەپرسێتەوە، ئەوسا لەهەرکس بیەوێت خۆش دەبێت و

---

[٦] تەفسیری ئاسان: ٤٢ ـ ٤٣.

[٧] (طبراني) لە(کبیر)داو (حاکم) یش لە(ابن مسعود)ەوە بە(صحیح)ی دەگێڕنەوە؛ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ئەوەی لەماڵەوە دە ئایەت لەسوورەتی (البقرة) بخوێنێت شەیتان ناچێتە نێو ئەو ماڵەوە هەتا رۆژ هەڵدێت ، چوار ئایەتی سەرەتای (البقره)و ئایەتی (الکرسی)و لەگەڵ دووئایەتی دوای خۆی و هاوکات لەگەڵ دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتەکە)).

هەرکەس بیەوێت سزای دەدات و خوایش بەسەر هەمووشتێکدا دەسەلآتی هەیە، پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بەخواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی دەڵێن: هیچ جۆرە جیاوازیەك ناکەین لەنێوان هیچ پێغەمبەرێ لەپێغەمبەرەکانی خوادا ، هەروەها وتیان: گوێڕایەڵ و ملکەچین بۆ بەدیهێنەرمان ، پەروەردگارا؛ لێخۆشبوونی تۆمان دەوێت و سەرئەنجام هەر بۆلای تۆیە گەڕانەوە، خوای گەورە ئەرك ناخاتەسەر هیچ کەسێك مەگەر بەقەدەر توانای خۆی نەبێت ، هەرکارێکی چاك ئەنجام بدات قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی و هەر خراپەیەکی کردبێت تەنها یەخەی خۆی دەگرێت و لەسەر خۆیەتی ، پەروەردگارا؛ لێمان مەگرە ئەگەر فەرامۆشیمان بەسەردا هات یان گوناهو هەڵەیەکمان لەدەست قەوما، پەروەردگارا؛ ئەرکی سەخت و کاری گران مەدە بەسەرماندا وەکو ئەوەی داوتە بەسەر ئەوانەی پێش ئێمەدا، پەروەردگارا؛ ئەرکێك مەدە بەسەرماندا لەتواناماندا نەبێت ، تووشی بەلآو ناخۆشیەکمان مەکە تواناو هێزو هەناومان لێ بڕێت، گوناهمان بسڕەوەو چاوپۆشی بکە لەهەڵەو تاوانەکانمان و دای پۆشە، داواکارین بەزەییت بێتەوە پیاماندا، ڕەحممان پێبکە ، هەر تۆ پشت و پەناو یاریدەدەری

ئێمەیت، جا بۆیە داوا دەکەین سەرمان بخەیت بەسەر قەومی کافرو خوانەناساندا))[8].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴿الم ، اللَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ . وَعَنَتِ الْوُجُوهُ لِلْحَيِّ الْقَيُّومِ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْماً، وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلا يَخَافُ ظُلْماً وَلا هَضْماً﴾[9] [(آل عمران:٢)] [(طـه:١١١ـ ١١٢)].

واتە: ((بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ، ئەو پیتانە بەتەنیا پەروەردگار دەزانێت مانایان چی‌یە ، خوا زاتێکە هیچ خوایەکی تر نی‌یە شایەنی پەرستن بێت‌و ئەو هەمیشە زیندووەو راگرو سەرپەرشتیاری هەموو دروستکراوەکانیەتی[10]. هەرچی روخسارەکانە (لەرۆژی قیامەتدا) ملکەچ‌و فەرمانبەردارن ، بۆ ئەو زاتەی کەهەمیشە زیندووەو دەسەڵاتی بێ سنووری هەیە، بێگومان ئەوەی ستەمی کردووە؛ رەنج بەخەسارو نائومێدو بێ هیوایە ئەوەش کەکارو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدات‌و لەکاتێکدا

---

[8] تەفسیری ئاسان: ٤٩.

[9] (قاسم)ی کوڕی (عبدالرحمن) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((ناوی مەزنی پەروەردگار لەسێ سوورەتدایە: لە (البقرة)و (ال عمران)و (طه)دا . پاشان (قاسم) دەڵێت بەدوایدا چووم‌و بەدیمکرد لە(البقرة)دا لە(ایە الكرسی)دایەو لە( ال عمران)یشدا لە ﴿الم ، اللَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ و لە (طە)شدا لە ﴿وَعَنَتِ الْوُجُوهُ لِلْحَيِّ الْقَيُّومِ ﴾ دایە . [(رواه الحاكم ولم يتعقبه الذهبي].

[10] تەفسیری ئاسان: ٥٠.

ئیمانداریش بووبێت ، ئەوە ئیتر ناترسێت لەوەی ستەمی لیَ بکرێت یان مافی پێشێل بکرێت))[11].

﴿حَسْبِيَ اللّهُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾[12] (حەوت جار)

واتە: ((من خوام بەسە یارو یاوەرم بێت ، کەپشتگیرو یاریدەدەرم بێت ، هیچ خوایە نیە جگە لەو هەر پشت بەو دەبەستم ، ئەو زاتەشە پەروەردگاری عەرشی گەورەیە))[13].

﴿قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ أَيّاً مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى وَلا تَجْهَرْ بِصَلاتِكَ وَلا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً، وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَداً وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ وَلِيٌّ مِنَ الذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيراً﴾[14] [(الاسراء: ١١٠ ـ ١١١)].

---

[11] تەفسیری ئاسان: ٣١٩.

[12] (ابی الدرداء) ـرەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی هەموو رۆژێك بەیانیان و ئێواران (حەوت جار) بڵێ: من خوام بەسە یارو یاوەرم بێت ، کەپشتگیرو یاریدەدەرم بێت ، هیچ خوایەك نیە جگە لەو ، هەر پشت بەو دەبەستم، ئەو زاتەشە پەروەردگاری عەرشی گەورە، ئەوا پەروەردگار لەغەم و پەژارەی دنیاو قیامەت دەیپارێزێت)) [(اخرجه ابن السني وابن عساكر مرفوعا واخرجه ابوداود موقوفا على ابي الدرداء)]

[13] تەفسیری ئاسان: ٢٠٧.

[14] (ابی موسی) ی (اشعری) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی بەیانیان و ئێواران

واتــە: ((پێیــان بڵــێ: ئێــوە لــەنزاو دوعاتــاندا هــاوار لە(الله)بکەن، یـان بەسیفەتی پیرۆزی (الرحمن) هانـای بـۆ بەرن، بەهەر ناوو سیفەتێکی جوان‌و بەرز هاواری لێبکەن‌و نزا بکەن دروستە، چونکە ئەو خاوەنی هەموو سیفات‌و ناوە پــیرۆزو جوانەکانــە، بەهــەر ســیفەتێك کەلەگــەڵ داخوازییەکانتاندا گونجا، داوای لێ‌بکەن، لەکاتی خوێندنی قورئان لەنوێژەکاندا دەنگ بەرز مەکەنــەوەو زۆریــش نزمــی مەکە، لەونێوانەدا حاڵەتێکی لەبارو مامناوەندی ئەنجام بدە، بڵــێ: ســوپاس‌و ســتایش بــۆ ئــەو خوایــەی کەکەســی نەکردووە بە رۆڵەی خۆی‌و رۆڵەشی هــەر نی‌یــە ، هــەروەها لەموڵك‌و مەملەکەتیدا کەسی نەکردووە بەشەریك‌و هاوتـای خۆی ، هەرگیز بەهۆی بێ دەسەلاتی‌و کەم توانینەوە کەسی نەکردووە بـەیاوەرو یـاریدەدەری خـۆی لەبەرئـەوە هەمیشـە (الله اکبر) بڵێ‌و ئەو زاتە بەگەورەو مەزن بزانە))[15].

﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ، فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ،وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَـهاً آخَرَ لا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ، وَقُلْ

---

ئایەتی :﴿ قُلِ ادْعُوا اللَّــهَ أَوِ ادْعُــوا الرَّحْمَــنَ ﴾ تاکۆتایی سوورەتەکە بخوێنێــت دڵــی ئــەو رۆژەو شــەوەکەی زینــدوو دەبێــت‌و نــامرێت)) [(اخرجه الديلمي في مسند الفردوس)].

[15] تەفسیری ئاسان: ٢٩٣.

رَبُّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ﴾[١٦] (المؤمنون:١١٥ ـ ١١٨).

واتە: ((ئایا گومانتان وادەبرد کەبەراستی ئێمە ئێوەمان بەبێ مەبەست دروستکردووەو ئێوە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە؟! بەرزیو بڵندی بۆ خوا، پاشای رەوای حەق، هیچ خوایەك نییە جگە لەو زاتە، خاوەنی عەرشی شکۆدارو بەرێزە ، ئەوکەسەی خوایەکی تر بریار بدات و بیکاتە شەریکی خوا، لەکاتێکدا کەهیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیە، ئەوە بەراستی حساب و لێپرسینەوەی لای پەروەردگارێتی ، بێگومان بێباوەرو خوانەناسان سەرفرازنابن ، ئەی (محمد(ﷺ) ، ئەی ئیماندار! تۆ بڵێ: پەروەردگارا؛ لەگوناهو هەڵەکانم خۆشببەو رەحمم پێ بکە چونکە تۆ لەهەموو میهرەبانان میهرەبانتریت))[١٧].

﴿ فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ، وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ، يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ

---

[١٦] (محمد)ی کوری (ابراهیم)ی (یمیی) لەباوکیەوە دەگێرێتەوە؛ دەفەرموێت: ((سریەیەك بووین پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرێی کردین و فەرمانی پێداین ئێواران و بەیانیان ئایەتەکانی:﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً ﴾ بخوێنینەوەو ئێمەش فەرمانەکەمان بەجێگەیاندو بەمەش پارێزراین و دەستکەوتیشمان چنگ کەوت)) [(اخرجه ابن السني وابو نعيم وابن مندة)].

[١٧] تەفسیری ئاسان: ٣٤٩.

وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ، وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ، وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ،وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْعَالِمِينَ، وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُمْ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ، وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ، وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ تَقُومَ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِنَ الْأَرْضِ إِذَا أَنْتُمْ تَخْرُجُونَ، وَلَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَهُ قَانِتُونَ﴾[18]. [(الروم:١٧. ٢٦)].

واته: ((كەواتە پاكىو بێگەردىو ستايش بۆ خوا، كاتێك كەئێوارەو بەيانى دەكەنەوە، شوكرو سوپاسگوزارى هەر شايستەى زاتى خوايە لەئاسمانەكانو زەويدا، لەكاتى عيشاو تاريكيدا، هەروەها كاتێك كەنيوەڕۆ دەكەنەوە، ئەو خوايە زيندوو لەمردوو دەردەهێنێت، مردوويش لەزيندوو دەردەهێنێت، زەوى دواى مردنى زيندوو دەكاتەوە، جا هەر ئابەو شێوەيە ئێوەش لەگۆڕەكان دەردەهێنرێنەوە .

---

(١٨)(ابن عباس) ـرەزاى خواى لێبێت ـ لەپێغەمبەرى خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((ئەوەى بەيانيانو ئێواران ئەم ئايەتانە بخوێنێت زيكرو يادى لەكيس چووى ڕۆژ يان شەوى دەستدەكەوێتەوە)) [(رواه ابوداود)].

لەنیشانەو بەڵگەکانی خوا ئەوەیە ئێوەی لەخاك دروستکردووە، لەوەودوا دوای بڕینی چەند قۆناغێك کوتوپڕ بوونەوە بەمرۆڤێك و بڵاودەبنەوە بەزەویدا ، یەکێك لەنیشانەو بەڵگەکانی تری ئەوەیە: کەهەر لەخۆتان هاوسەری بۆ دروستکردوون بۆئەوەی ئارام بگرن لەلایداو لەنێوانتاندا خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئالەودیاردانەدا نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیردەکەنەوەو تێدەفکرن، یەکێکی تر لەنیشانەو بەڵگەکانی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویەو جیاوازی زمان و رەنگتانە، بەڕاستی ئالەو دیاردەیەشدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ زانایان و شارەزایان. یەکێکی تر لەنیشانەو بەڵگەکانی خەوتنتانە لەشەوورۆژدا، لەکاتی بێداریشدا هەوڵ و کۆششتانە بۆ بەهرە وەرگرتن لەبەخششەکانی خوا، جا بەڕاستی ئالەو دیاردەیەشدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك کەدەبیستن و تێدەگەن، هەروەها لەبەڵگەو نیشانەکانی تری ئەوەیە کەهەورەبروسکەتان نیشان دەدات کەترسی لێدەکرێت و ئومێد بەخشیشەو لەئاسمانەوە باران دەبارێنێت، زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە دوای ئەوەی کەمردبوو، بەڕاستی ئالەو دیاردەیەشدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك ژیریان بخەنە کار ، لەنیشانەو بەڵگەکانی تری خوا ئەوەیە کەئاسمانەکان و زەوی راوەستاون بەفەرمانی ئەو ، لەوەودوا کاتێك بانگێکی لێکردن ، کەئێوە لەتوێی خاکدان ،

دەستبەجێ هەمووتان دەردەچن لەزەویداو زیندوو دەبنەوە، هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەمووی ئەو بەدیهێنەریانەو خاوەنیانە، هەر هەمووشیان ملکەچ و فەرمانبەرداری ئەون))[19].

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، حم ، تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ، غَافِرِ الذَّنْبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ شَدِيدِ الْعِقَابِ ذِي الطَّوْلِ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾[20] [(غافر:١ـ ٣)].

واتە: ((بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ، (بەتەنیا خوا مانای ئەم پیتانە دەزانێت) ، هاتنە خوارەوەی ئەم قورئانە لەلایەن خوای بالأدەست و شارەزاو زاناوەیە، هەمیشە ئەو زاتە لێخۆشبووی گوناهو، وەرگری تەوبەو پەشیمانیە لەبەندە گوناهبارەکانی و، تۆڵەسێنەرە زۆر بەسەختی لەیاخی بووان و ستەمکاران ، دەسەڵاتدارەو خاوەن بەخشێنەری نازو نیعمەتەکانە، هیچ خوایەك نیە جگە لەو ، سەرەنجامیش هەر بۆلای ئەوە))[21].

---

[19] تەفسیری ئاسان: ٤٠٦ ـ ٤٠٧.

[20] (ابی هریرە) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی بەیانیان ئێواران (حم ، سوورەتی المؤمن ... الیه المصیر) و (ایە الکرسی) بخوێنێت بێگومان پارێزراو دەبێت لەبەیانی تائێوارەو لەئێوارەش هەتا بەیانی)). [(اخرجە الترمذي والدارمي وابن السني والمروزي)].

[21] تەفسیری ئاسان: ٤٦٧.

﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ، هُوَ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ، هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾. [(الحشر:٢٢ـ ٢٤)].

واتە: ((خـوا ئـەو زاتەیـە کەجگەلـەو خوایـەکی تـر نیـە، زانایە بەهەموو نهێنیو ئاشکراکان ، ئەو خوایە بەخشندەو میهرەبانو دلۆڤانە کانگای رەحمو بەزەییە، خوا ئەو زاتەیە کەجگە لەو خوایەکیتر نیە پاشای هەموو بوونەوەرە، پاكو بێگەردو پوختە، ئاشتیخوازو ئاشتی پەروەرە، ئاسایش بـەخشو پـەناگای ئیماندارانـە، دەسـەلأتدارە وچـاودێری دروسـتکراوەکانیەتی، بـالاّ دەسـتە، خـاوەنی خـێری بیٚسـنوورە، گەورەیـەو خـۆی بەگـەورە دەزانێـت ، پـاكو بێگەردی بۆ ئەو خوایەیە لـەوەی تـیٚ نەگەیشتوان شەریكو هـاوەڵی بـۆ بڕیـار دەدەن. هـەر ئـەو خوایـە بەدیهێنـەرو دروستکارە ، نەخشەو وێنە کێشەرە، ناوە پیرۆزو جوانەکان، هەمووی شایستەی ئەون، هـەرچی لەئاسمانـەکانو زەویـدا هەیە ستایشـی ئـەو دەکـەن، بەڕاسـتی ئـەو زاتـە خوایـەکی بالأدستو دانایە))[٢٢].

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا، وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا، وَقَالَ الْإِنْسَانُ مَا لَهَا، يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ

---

[٢٢] تەفسیری ئاسان: ٥٤٨.

أَخْبَارَهَا، بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا، يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتاً لِيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ ، فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾[23] [(الزلزله:١-٨)].

واتە: ((بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ، کاتێك زەوی دەهێنرێتە لەرزەو بومەلەرزە زۆر بەهێزەکەی بۆ پێشهات، هەرچی لەزەویدا هەبوو لەماددە سەنگینەکانی ناوی دەری پەڕاندو هێنایە دەرەوە، ئادەمیزادیش دەڵێت: ئەوە چیەتی ، بۆ وای لێهات، لەو رۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی دەگێڕێتەوە ..بەهۆی ئەوەی کەپەروەردگارت ڕایگەیاندووەو فەرمانی کۆتایی هاتنی بۆ دەرکردووە، ئەو رۆژە خەڵکی دەستەدەستە بەرەو گۆڕەپانی لێپرسینەوە دەردەچن، بەپەرش و بلاوی، تاکارو کردەوەکانیان ببیننەوە، جائەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە، ئەوەش کەبەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕو خراپەی هەبێت دەیبینێتەوە))[24].

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ، لا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ، وَلا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ، وَلا أَنَا عَابِدٌ مَا عَبَدْتُمْ، وَلا أَنَا

---

[23] (ابن عباس) ـرەزای خوای لێبێت . فەرموودەیەکی بە(مرفوع)ی هێناوەو دەفەرموێت: ((سوورەتی ﴿إِذَا زُلْزِلَت﴾ هاوتای نیوەی قورئانە)) [(رواه الترمذي والحاكم من حديث يمان ابن المغيرة)]

[24] تەفسیری ئاسان: ٥٥٩.

عَابِدٌ مَا عَبَدْتُمْ ، وَلا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ، لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾[25] [(الكافرون: ١ــ٦)].

واتە: (( بەناوی خوا بەخشندەو میهرەبان، ئەی محمد(ﷺ) بڵێ : ئەی کۆمەڵی بێباوەڕو خوانەناسان، من هەرگیز ئەو شتانەی کەئێوە دەیپەرستن نایپەرستم،ئێوەش دیارە ئەوەی من دەیپەرستم نایپەرستن، ئەوەی ئێوە پەرستووتانە من هیچ کات نایپەرستم، ئێوەش ئەو زاتەی من دەیپەرستم نایپەرستن کەواتە دینی خۆتان بۆ خۆتان، دینی خۆم بۆ خۆم))[26].

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ، وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجاً، فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً﴾[27] [(النصر: ١ ــ٣)].

واتە: ((بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ، کاتێك یارمەتیو کۆمەکی خوادێت ، شاری مەککە ڕزگار دەکرێتو

---

[25] لەمیانەی فەرموودەکەی (ابن عباس) ـرەزای خوای لێبێت ـ هاتووە: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾چارەکێکی قورئانە)). [(رواه الترمذي والحاكم وقال صحيح الاسناد)]

[26] تەفسیری ئاسان: ٦٠٣.

[27] (انس) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەیەکێك لەیارانی فەرموو: ئاخۆ سوورەتی ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ، وَرَأَيْتَ النَّاسَ﴾ لەبەر نییە ، ئەویش فەرمووی: بەڵێ پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: کەواتە چارەکێکی قورئانە)). [(رواه الترمذي وقال حديث حسن)]

دەرگای ئازادی والآدەکرێت ، خەڵکیشت بینی پۆل پۆل دەچنە ریزی ئاینی خواوە، ئەوسا ئیتر تۆ سوپاس و ستایشی پەروەردگارت بکەو داوای لێخۆشبوونی لیْبکە ، چونکە بەراستی خوا زۆر چاوپۆشی دەکات و تەوبە وەرگرە))[٢٨].

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، اللَّهُ الصَّمَدُ، لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ﴾. [(الاخلاص: ١ـ٤)].

واتە: ((بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان : ئەی محمد(ﷺ) ئەی ئیماندار بڵێ: ئەو خوایەی کەناوی (الله)یە خوایەکی تاك و تەنهایە، خوازاتێکی پایەدارو دەسەلاتدارە ، نیازی بەکەس نیەو هەمووان ئاتاجی ئەون ، هەر ئەو دەتوانێت بەلاو ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێبەجێ بکات،هیچ کەسی لێ نەبووەو خۆیشی لەکەس نەبووە، هەرگیز هاوتاو هاوشێوەو دەسەلاتدارێکی تر نیە کەلەبەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت))[٢٩].

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ، قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ، وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ، وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾ [(الفلق: ١ـ٥)].

---

[٢٨] تەفسیری ئاسان: ٦٠٣.

[٢٩] تەفسیری ئاسان: ٦٠٤.

واتـە: ((بـەناوی خـوای بەخشـندەو میـهرەبان: ئـەی محمـد(ﷺ) ، ئـەی ئیمـاندار بڵـێ: پـەنا دەگـرم بـەو پـەروەردگارەی کەبەرەبـەیان پێـش دەهێنێـت ، لەشـەڕو خراپەی هەرچی کەدروستی کردووە، لەشەڕوو خراپی شەو کاتێك کەدادێتو دنیا تاریك دەبێتو دەبێت بەشەوە زەنگ ، لەشەڕو خراپـەی ئـەو کەسانەی کـەجادوو دەکـەنو پـەتو دەزوو گـرێ دەدەنو فـووی پیادەکـەن، لەشـەڕو خراپـەی حەسـوودو بـەخیل ، کـاتێك کەحەسـوودیو بـەخیلی دەبات))[30].

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ،قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ، مَلِكِ النَّـاسِ، إِلَهِ النَّاسِ، مِنْ شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ، الَّذِي يُوَسْوِسُ فِـي صُـدُورِ النَّاسِ، مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ﴾[31] [(الناس: ١ــ٦)].

---

[30] تەفسیری ئاسان: ٦٠٤.

[31] (عبـدالله)ی کـوڕی (خبیـب) ـ ڕەزای خـوای لێبێـت . دەفـەرموێت: شەوێکی ئەموستەچاوی بارانـاوی بەدەرکەوتین لەگەڵ هـاوەڵان هـەتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بدۆزینـەوەو بـەر نوێژیمـان بـۆ بکـات، لەجێگـەو شوێنێك بەدیمانکردو ڕووی کردە منو سێجار پێی وتم: بڵێ:..منیش جاری سێیەمیان پرسیم: چی بڵێم ئەی فرستادەی خوا ؟ فەرمووی: ئێواران‌و بەیانیان سێجار ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّـاسِ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾بخوێنە پارێزراوو قوتار دەبیت لەهەموو خراپەو ناشوبێك)) [(اخرجه ابوداود والترمذي والنسائي وقال الترمذي: حديث حسن صحيح)].

واتــه: ((بــەناوی خــوای بەخشــندەو میــهرەبان، ئــەی محمد(ﷺ) ، ئەی ئیماندار بڵـێ: پــەنادەگرم بەپــەروەردگاری خەڵکی، بەپادشـای خـەڵکی ، بـەخودای خـەڵکی ، لەشـەڕو خراپەی ئەوەی کەوەسوەسەو خەتەرەو خەیاڵ دەخاتە دڵەوە کـە(خەنناسـە) بریتی‌یـە لـەوەی کەوەسوەسـە فـڕێ دەداتـە سـینەو دڵ‌و دەروونـی خەڵکیـەوە، لەپـەری‌و خـەڵکی، لەجنۆکەو ئادەمیزادی شەیتان سیفەت))[٣٢].

((أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ للهِ وَالحَمْدُ للهِ لاَشَرِيكَ لَهُ، لاَ اِلَهَ الاَّ هُـوَ وَالَيْهِ النُشُورِ))[٣٣]. (سیٚ جار)

واته: ((ڕۆژمان لێ بوویەوەو موڵك‌و تەختی دەسەڵات هەر پـەروەردگار خاوەنیـەتی‌و سـوپاس‌و سـتایش بـۆ خـوای بێ‌هاوەڵ‌و هاوبەشـە، ئـەو پـەروەردگارەی تـاك‌و تەنیایـەو بۆلای ئەویش زیندوو دەبینەوە)).

---

[٣٢] تەفسیری ئاسان: ٦٠٤.

[٣٣] (ابی هريره) ـرەزای خوای لێبێت . دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەیانی لێ بهاتایە دەیفەرموو: ((ڕۆژمان لێ بوویـەوەو موڵـك‌و تەختی دەسەڵات هەر پەروەردگار خاوەنیەتی‌و سوپاس‌و ستایش بۆ خوای بێ‌هاوەڵ‌و هاوبەشە ، ئەو پەروەردگارەی تاك‌و تەنیایەو بۆلای ئەویش زینـدوو دەبینـەوە، کـاتێ ئێـوارەش دادەهـات دەیفـەرموو: ئێوارەمـان لێ‌داهـات‌و موڵـك‌و تـەختی دەسـەڵات هـەر پـەروەردگار خاوەنیەتی‌و سوپاس‌و ستایش بۆ خوای بێ‌هاوەڵ‌و هاوبەشـە، ئـەو پەروەردگارەی تاك‌و تەنیایەو بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە)) [(اخرجه ابن السني والبزار)].

((أَصْبَحْنَا عَلَى فِطْرَةِ الأسْلاَمِ، وَكَلِمَةِ الأخلاَصِ ، وَعَلَى دِينِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ(ﷺ) وَعَلَى مِلَّةِ أَبِينَا اِبْرَاهِيمَ حَنِيفَاً وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ))[٣٤].(سێجار)

واتە: ((ڕۆژمان لێبوویەوە لەسەر سروشتی پاك‌و بێگەردی ئیسلام‌و پەیمانی دڵسۆزی‌و ئەمەكداری‌و ئاینی (محمد) پێغەمبەرمان (ﷺ) لەگەڵ نەوەی (ابراهیم)ی باوانمان كەیەكتاپەرست بوو لەهاوەڵ دانەران نەبوو)).

((اللهُمَّ انِيِّ أَصْبَحْتُ مِنْك فِي نِعْمَةٍ وَعَافِيَةٍ وَسِتْرٍ فَأتِمَّ عَلَيَّ نِعْمَتَكَ وَعَافِيَتَكَ وَسِتْرَكَ فِي الدُّنيَا وَالاخِرَةِ))[٣٥]. (سێجار)

---

[٣٤](ابی)ی كوڕی (كعب) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فێری دەكرێت كاتێ ڕۆژمان لێبوویەوە بڵێت: ((ڕۆژمان لێبوویەوە لەسەر سروشتی پاك‌و بێگەردی ئیسلام‌و پەیمانی دڵسۆزی‌و ئەمەكداری‌و ئاینی محمد(ﷺ) پێغەمبەرمان (ﷺ) هاوتا لەگەڵ (ابراهیم)ی باوانمان كەیەكتاپەرست بوو لەهاوەڵدانەران نەبوو)) ئێوارانیش هەمان زیكری دووبارە دەكردەوە)) [(أخرجه عبدالله ابن الامام احمد في زوائده)]

[٣٥] (ابن عباس) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: هەركەسێك بەیانیان‌و ئێواران سێجار بڵێ: ((پەروەردگارا؛ ڕۆژم لێبوویەوە بەسەر نازو نیعمەت‌و لەش ساغی‌و داپۆشینی كەم‌و كوڕیەكانم ، خوایەگیان هەمیشە لەدنیاو قیامەتدا نازو نیعمەتەكانت بەردەوام ببەخشە پێم‌و لەش ساغ‌و بێوەیم بكەو كەم‌و كوڕیەكانم داپۆشە))ئەوا پەروەردگار پێویستی كردووە لەسەر خۆی نازو نیعمەتەكانی بڕێژێ بەسەریدا)) [(رواه ابن السني)].

واتــە: ((پــەروەردگارا؛ رۆژم لێبوویــەوە بــەنازو نیعمــەتو لــەش ســاغیو داپۆشــینی کــەمو کورپــەکانم ، خوایــەگیان نازونیعمەتەکانت بەردەوام ببەخشە پێمو ساغو بێوەیم بکەو کەمو کورپیەکانم دابپۆشە)).

((اللهُمَّ مَا أصْبَحَ بِي مِنْ نِعْمَةٍ أوْ بأحَدٍ مِنْ خَلْقِكَ ، فَمِنْكَ وَحْدَكَ لاَشَرِيكَ لَكَ ، فَلَكَ الحَمْدُ وَلَكَ الشُّكْرُ))[٣٦] (سیٚجار).

واتــە: (پــەروەردگارا؛ هــەر نــازو نیعمــەتو بەخششــێك بەســەر مــنو دروســتکراوانی دیکــەدا رشــتووتە بەتــەنیا لای تۆی بێهاوەڵو هاوتاوەیەو، ستایش سوپاسگوزاریش هەر لە بۆ تۆیە)).

((يَا رَبِّ لَكَ الحَمْدُ كَمَــا يَنْبَغِــي لِجَــلاَلِ وَجْــهِكَ وَعَظِيــمِ سُلْطَانِكَ))[٣٧] (سیٚجار).

---

[٣٦] (عبـدالله)ی کـوڕی (غنـام)ی (بیـاصی) ــ ڕەزای خـوای لێبێـت ــ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتـەوە ، دەفـەرموێت: ئـەوەی بـەیانیان بڵـێ: ((پـەروەردگارا؛ هـەر نـازو نیعمـەتو بەخششـێك بەسـەر مـنو دروسـتکراوانی دیکـەدا رشـتووتە بەتـەنیا لای تـۆی بێهـاوەڵو هاوتاوەیـەو سـتایشو سوپاسـگوزاریش هـەر لـەبۆ تۆیـە)) ئـەوا سوپاسگوزاری ئەو ڕۆژەی کردووەو ئەوەشی ئێواران هاوچەشنی ئەم زیکرە بڵێت سوپاسگوزاری شەوی نواندوە)). [(رواه أبوداود والنسائي وابن حبان في صحيحه)].

[٣٧] (عبـدالله)ی کـوڕی (عمـر) ــ ڕەزای خـوای لێبێـت ــ لەپێغەمبـەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: بەندەیەکی پەروەردگار نزایکردو وتـی: پـەروەردگارم سوپاسو سـتایش دەخەمە ڕوو بۆ تۆ بەچەشـنی

واتە: ((پەروەردگارم سوپاس‌و ستایش دەخەمە ڕوو بۆ تۆ بەچەشنی گونجاوو شایستەی شکۆمەندی رووخسارو مەزنی دەستەلاَت‌و توانات)).

((رَضِيتُ بِاللهِ رَبَاً وَ بالأسْلاَمِ دِيناً ، وَبِمُحَمَدٍ نَبِياً وَرَسُـولاً))[٣٨] (سیٛ‌جار)

واتە: ((رازیم پەروەردگارم (الله) بێت‌و ئاینم ئیسلام‌و (محمد)یش پێغەمبەرو فرستادەم بێت)).

---

گونجاوشایستەی شکۆمەندی رووخسارو مەزنی دەستەلاَت‌و توانات)) فریشتەکان دەستەوەستانمان‌و دییەیان نابینابوو نەیان زانی بەچ شێوازێك بینووسن.. بەرزبونەوە بۆ ئاسمان‌و وتیان: پەروەردگارا! بەندەکەت نزایەکی کرد نەمانزانی چۆن تۆماری بکەین.. پەروەردگاریش وێڕای زانیاری سەبارەت بەنزای بەندەکەی دەپرسی: چی وت بەندەکەم ؟ فریشتەکانیش دەڵێن وتی: پەروەردگارم سوپاس‌و ستایش دەخەمە ڕوو بۆ تۆ بەچەشنی گونجاوو شایستەی شکۆمەندی‌و رووخسارو مەزنی دەستەلاَت‌و توانات)) پەروەردگار دەفەرمویٛ: بەوچەشنەی خۆی تۆماری بکەن هەتا بەدیداری بەندەکەم دەگەم ئەوجا پاداشتی دەدەمەوە لەسەری)) [(رواه احمد وابن ماجه ورجاله ثقات)]

[٣٨] (ابی سلام)ی کوری (غنام) ـ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: ((ئەوەی بەیانیان‌و ئێواران بلێت: (رازیم پەروەردگارم (الله)بێت‌و ئاینم ئیسلام‌و (محمد)یش پێغەمبەرو فرستادەم بێت ، پەروردگار بەپێویستی گێڕاوە لەسەر خۆی رازی بکات)) [(رواهُ ابوداد والترمذي والنسائي والحاكم)].

((سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ ، عَدَدَ خَلْقِهِ وَرِضَا نَفْسِهِ ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ))[٣٩] (سێ جار)

واتە: ((بێگەردیو پاکیو ستایش بۆ پەروەردگار بەئەندازەی ژمارەی دروسکراوەکانیو رەزامەندی نەفسیو کێش وبارستایی عەرشیو گوشادو فراوانی وتە پیرۆزەکانی)).

((بِسْمِ اللهِ الذِي لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ العَلِيم ))[٤٠] (سێ جار).

---

[٣٩] خاتوو (جویریە)ی دایکی موسوڵمانان ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: بەیانیەکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو بۆ نوێژو گەڕایەوەو بۆ جارێکی دیکەش گەڕایەوە لەچێشتەنگاودا ، منیش هەر لەحاڵی پێشووی خۆمدابووم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لێی پرسیم: بەردەوام لەسەر ئەو حاڵو بارەی پێشووتیت؟ وتم: بەڵێ ، ئەویش فەرمووی: دوای تۆ چوار وتەم سێ جار دووپات کردەوە گەر بەراوردبکرێت لەگەڵ وادەی دانیشتنی تۆدا هاوسەنگو بەرابەر رادەوەستن ئەو چوار وتەیەش ئەمەیە: بێگەردیو پاکیو ستایش بۆ پەروەردگار بەئەندازەی ژمارەی دروستکراوەکانیو رەزامەندی نەفسیو کێشو بارستایی عەرشیو گوشادو فراوانی وتەکانی)).

[٤٠] (عثمان)ی کوڕی (عفان) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: هەر بەندەیەك بەیانیانو ئێواران سێ جار بڵێت: بەناوی ئەو خوایەی هەرگیز زیانو نوشستی ناکەوێت لەهیچ بوونێك بەبردنی ناوی ئەو لەزەویو ئاسمانو خۆیشی بیسەرو

واتە: ((بەناوی ئەو خوایەی هەرگیز زیان و نوشستی ناکەوێت لەهیچ بوونێك لەزەوی و ئاسمان بەبردنی ناوی و خۆشی بیسەرو زانایە بەڕووداوەکان)).

((اللهُمَّ انَّا نَعُوْذُ بِكَ مِنْ أَنْ نُشْرِكَ بِكَ شَيْئاً نَعْلَمُهُ وَنَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لاَ نَعْلَمُهُ))[41] (سێ جار)

واتە: پەروەردگارا؛ پەنات پێدەگرین لەوەی هاوەڵت بۆ پەیدا بکەین بەزانین و بمانبەخشە لەوەشی بێئاگاو نەزانین پێی)).

((أعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَامَاتِ مِنْ شَرِ مَا خَلَقَ))[42] (سێ جار).

---

زانایە بەڕووداوەکان)) ئەوا هیچ زیانێکی پێناگات)). [(رواه ابوداود والترمذي وقال: حديث حسن صحيح)].

(41) (ابو موسى)ی (اشعری) ـ رەزای خوای لێبێت . دەفەرموێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتارێکی بۆ داین و فەرمووی: خەڵکینە خۆتان بپارێزن لەهاوەڵ پەیداکردن و ئاگاداربن لەوەی هاوەڵ پەیداکردن نادیارو پەنهان ترە لەجی پێی مێرووله، یارانیش زۆریان وت و دواتر پرسیان: چۆن خۆمان بپارێزین لێی لەکاتێکدا پەنهانتربێت لەجێ پێی مێرووله؟ فەرمووی: بڵێن: پەروەردگارا؛ پەنات پێدەگرین لەوەی هاوەڵت بۆ پەیدابکەین بەزانین و بمانبەخشە لەوەشی بێئاگاو نەزانین پێی)) [(رواه أحمد والطبراني باسناد جيد و (ابو يعلى)ش بەم چەشنە هێناویەتی و دەستەواژەی لەهەموو ڕۆژێك سێ جار)ی تێدایە)].

(42)(ابی هريره) ـ رەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە ؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی سێ جار ئێواران بڵێ: پەنادەگرم بەوتە پیرۆزو تەواوەکانی پەروردگار لەشەڕو خراپەی دروستکراوانی

واتـە: ((پـەنادەگرم بەوتـە پیرۆزو تـەواوەکانی پـەروردگار لەشەڕو خراپەی دروستکراوانی)).

((اللهُمَّ اني أعُوذُ بكَ مِنَ الهَم و الحَزَن وأعُوذُبكَ مِـــنَ العَجْـــزِ وَالكَسَلِ . وأَعُوذُبكَ مِنْ الجُبْنِ وأَعُوذُبكَ مِنْ غَلَبَـــةِ الدَّيْـــنِ وَقَـــهْرِ الرِجَال))[٤٣] (سیٚجار).

واتـە: ((پـەروەردگارا؛ پـەنات پێدەگـرم لەغـەمو پـەژارەو بیٚدەستەلاٚتیو تـەمبـەڵیو ترسـنکۆیو زاڵبوونـی قـەرزاریو خەشمو تووڕەیی پیاوان)).

((اللهُمَّ انيٍ أعُوذُبكَ مِنَ الكُفرِ وَالفَقْرِ ، اللهُمَّ انِيٍ أعُوذُبكَ مِـــنْ عَذَابِ القَبْرِ لاَ الَهَ الاَّ أنْتَ))[٤٤] (سیٚجار).

---

پـەنای دەدرێتو ئـەو شـەوە زیانی پێناگـات)) [(رواه ابـن حبـان في صحيحه)].

[٤٣] (ابـی سـعید)ی (خدری) ـ رەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت: رۆژێکیـان پێغەمبـەر (ﷺ) هـات بـۆ مزگـەوت پیـاوێك لەپشـتیوانەکان بەناوی (ابـو امامـە)ی بینـیو لێـی پرسـی: بۆچـی لەمزگـەوتی کـاتی غـەیری نوێـژ ، ئـەویش وتـی: غـەمو پـەژارەو قـەرزاری تـەنگیان پێهـەڵچنیووم ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئـەویش (ﷺ) فـەرمووی: ئـاخۆ نزایـەکت فێرنەکـەم گـەر بیڵێیـت غـەمو پـەژارەت دەرەوێتـەوەو پـەروەردگاریش پشـتیوانیت لێدەکات لەبژاردنـەوەی قـەرزەکانتا؟ وتم: بەڵیٚ فێرم بکە ، فەرمووی بڵیٚ: (( پەروردگارا؛ پەنات پێدەگرم لەغەمو پـەژارەو بیٚ دەستەلاٚتیو تەمبەڵیو ترسـنۆکیو زاڵبوونـی قـەرزاریو غەمو تووڕەییپیـاوان )) منیـش بـەگوێم کـردو پـەروەردگار غـەمو پـەژارەی رەواندمـەوەو پشـتیوانی لێکـردم لەبژاردنـەوەی قەرزەکـەمدا)) [(اخرجه ابوداود)].

واتــە: ((پــەروەردگارا؛ پــەنات پێدەگــرم لــەبێباوەڕیو هــەژاریو نــەداریو ســزای نێوگــۆڕو بەتــەنیا هــەر تــۆ پەروەردگاریت)).

((اللهُمَّ عَافِنِي فِي بَدنِي ، اللهُمَّ عَافِنِي فِي سَمْعِي ، اللهُمَّ عَــافِنِي فِي بَصَرِي ، لاَ الَهَ الاَّ أنْتَ)) (سیٚجار).

واتە: ((پەروەردگارا؛ جەستەو گوێو دیبیەم تەندروستو ساغ بکەیو بەتەنیاش هەر تۆ پەروەردگاریت)).

((اللهُمَّ أنْتَ رَبِي لاَ الَهَ الاَّ أنْتَ خَلَقْتَنِي وَأنَا عَبْدُكَ وَأنَــا عَلَــى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ أعُوذُبكَ مِنْ شَرِ مَــاصَنَعْتُ ، أبُوءُلَــكَ بنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأبُوءُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي فَانَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذنُوبَ الاَّ أنْــتَ))[٤٥] (سیٚجار).

---

[٤٤] (عبدالرحمن)ی کوڕی (بکره) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: لەباوکم پرسی باوکە گیان هەموو ئێواران‌و بەیانیانێك سیٚجار گوێم لێیە دەپاڕێیتەوە دەڵێت: پەروەردگارا؛ جەستەو گوێو چاوم تەندروستو ساغ بکەو پەناشت پێدەگرم لەبێباوەڕیو هەژاریو نەداریو سزای نێوگۆڕو بەتەنیاش هەر تۆ پەروەردگاریت)) ئەویش وتی: گوێ بیستی پێغەمبەری خوا بووم بەم نزایە دەپاڕایەوە منیش دەمەوێت سوننەتی ئەو جێبەجێی بکەم)) [(رواه أبوداود وغيره)].

[٤٥] (شداد)ی کوڕی (اوس) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((شانزای لێخۆشبوون ئەوەیە بەندە بڵێت: ((پەروەردگارا؛ تۆی تاكو تەنیاو منیش بەندەی تۆم، خوایە گیان پابەندم لەسەر پەیمان‌و بەڵێنی خۆم هەتا بتوانم‌و ، پەنات پێدەگرم لەشەڕو خراپەی ڕەفتارمو دانیش دەنێم بەنازو نیعمەتەکانی تۆدا هاوکات لەگەڵ دان نانم بەگوناهو تاوانەکانم، خوایەگیان دەڵێم

واتــە: ((پــەروەردگارا؛ تــۆی پــەروەردگاری مـنو تــاكو تەنیایتو منیش بەندەی تۆم، خوایەگیان من پابەندم لەسـەر پەیمانو بەڵێنی خۆم هەتا بتوانمو ، پەنات پێدەگرم لەشەڕو خراپەی رەفتارمو دانیش دەنێم بەنازو نیعمەتـەكانی تـۆدا، هاوكات لەگەڵ دان نانم بـەگوناهو تاوانـەكانم ، خوایـەگیان دەڵێم ببورە چونكە بەتـەنیا هـەر تـۆی لێخۆشبووی گوناهو تاوان)).

(أَسْتَغْفِرُ اللهَ الــذِي لاَ اِلــهَ الاَّ هُــوَ الحَــيُّ القَيُّــوم وَأَتُــوبُ اِلَيهِ))[٤٦](سیّجار)

واتــە: ((داوای لێخۆشـبوون دەكــەم لــەو پــەروەردگارەی تاكو تەنیاو زیندوو جێگیرو بالأدەستەو تەوبەش بۆلای ئەو دەكەم)).

---

ببورە چونكە بەتـەنیا هـەر تـۆی لێخۆشـبووی گونـاهو تـاوان، ئـەوەی لەرۆژ یـان شـەودا بەدڵنیاییەوە بیخوێنێتو لەرۆژ یان شـەودا مـەرگ یەخـەی پــێ بگرێـت ئـەوا ئێوارەكـەی یـان بەیانیەكـەی دەخرێتــە بەهەشتەوە)).

[٤٦] (زید)ی بەندەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: باوكم گوێبیستی پێغەمبــەری خوابـوو كەفــەرمووبووی: ئــەوەی بڵــێ : ((داوای لێخۆشبوون دەكەم لەو پەروەردگارەی تاكو تەنیاو زیندوو جێگیرو بالأ دەستەو تەوبەش بۆلای ئەو دەكەم)) پەروردگار لێیی دەبوورێت گەر لەجەنگو بەرەكانیشی هـەڵبێت )).[رواه ابوداود والترمذي والحاكم ، وقال صحيح على شرط البخاري ومسلم)]

((اللهُمَّ صَلِّ عَلَى سَيِدِنَا مُحَمَدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى سَيِدِنَا ابْرَاهِيمَ وَعَلَى الِ سَيِدِنَا ابْرَاهِيمَ وَبَارِكْ عَلَى سَيِدِنَا مُحَمَدٍ وَعَلَى اَلِ سَيِدِنَا مُحَمَدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى سَيِدِنَا ابْرَاهِيمَ وَعَلَى الِ سَيِدِنَا ابْرَاهِيمَ فِي العَالَمِينِ انَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ))[٤٧]. (سیٚجار).

واتە: ((پەروەردگارا؛ سلاّوات دابباریّنە بۆ سەر گیانی گەورەو سەروەرمان (محمد)و خاوخیّزانی بەچەشنی سلاّوات دان لەدیاری (ابراهیم)ی سەروەرمان و پیرۆزیی و پتریی بخە لەگەورەو سەروەرمان (محمد)و خاوخیّزانی بەچەشنی فەرو پیرۆزیی و پتریی (ابراهیم)ی سەروەرمان و خاوخیّزانی لەجیهاندا بەڕاستی تۆ شکۆمەندو دەسەلاّتداری بالاّی)).

((سُبْحَانَ اللهِ وَالحَمْدُ للهِ وَلاَ الَهَ الاّ اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ))[٤٨].(سیٚجار)

واتە: ((بیٚگەردیو پاکیو ستایش بۆ پەروەردگارەو هیچ خوایەك نییە جگە لەزاتی (الله) نەبیٚت هەر ئەویش گەورەو بالاّیە)).

((لاَالَهَ الاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٍ))[٤٩] (سیٚجار)

---

[٤٧] بگەڕیٚرەوە بۆ پلەوپایەی سلاّواتدان لەدیاری پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) لەهەمان کتیٚبدا بەشی حەوتەم ..

[٤٨] بگەڕیٚرەوە بۆ بەشی (حەوت) پلەوپایەی زیکرو یادکەرەوان لەسوننەتی پیرۆزو شیریندا فەرمودەی (١١)یەم.

واتە: ((پەروەردگارتان تاكو تەنیاو بێهاوەڵەو موڵكو دەستەڵاتو ستایش هەر بۆ ئەوەو توانای بەجێگەیاندنی هەموو ویستێكی هەیە)).

((سُبْحَانَكَ اللهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أنْ لاَ اِلَهَ الاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأتُوبُ اِلَيْكَ))[50] (سێ جار)

واتە: ((پەروەردگارا؛ بێگەردیو پاكیو ستایش بۆ تۆیە، گەواهی تاكو تەنیایت دەدەمو داوای لێخۆشبوونو تەوبەش بۆلای تۆدەكەم)).

((اللهُمَّ صَلِّ عَلَى سَيِدِنَا مُحَمَدٍ عَبْدِكَ وَنَبِيكَ وَرَسُولِكَ النَبِيِّ الأمِيِّ وَعَلَى اٰلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِمْ تَسْلِيماً عَدَدَ مَا أَحَاطَ بِهِ عِلْمُكَ، وَخَطَّ بِهِ قَلَمُكَ وَأَحْصَاهُ كِتَابُكَ، وَأرْضَ اللهُمَّ عَنْ سَادَاتِنَا أبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ وَعَلِيٍّ وَعَنِ الصَحَابَةِ أجْمَعِين، وَعَنِ التابِعِينَ وَتَابِعِيهِم بِأحْسَانٍ اِلَى يَومِ الدِّين)).

---

[49] بگەڕێرەوە بۆ بەشی (حەوت) پلەوپایەی زیكرو یادوەران لەسوننەتی پیرۆزو شیریندا فەرموودەی (٨)ەم

[50] (جبیر)ی كوڕی (مطعم) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ئەوەی لەكۆتایی كۆڕو دانیشتنی یادو زیكردا بڵێت: ((پەروەردگارا؛ بێگەردیو پاكیو ستایش بۆ تۆیە، گەواهی تاكو تەنیایت دەدەمو داوای لێخۆشبوونو تەوبەش هەر بۆلای تۆ دەكەم)) وەك مۆركێك وایەو دانیشتنەكەی پێ مۆردەكرێتو ئەوەشی لەكۆڕی قسەی هەڵەتو بێسوودو بایەخدا بیڵێت تكاكارو لێخۆشبوون دەبێت بۆی)) [(رواه النسائي والطبراني والحاكم وغيرهم)].

واتـە: ((پـەروەردگارا؛ سـلاٚوات بـدە لـەدیاری (محمــد)ی بـەندەو پێغەمبـەرو فرستادەی نـەخوێندەوارتو سـلاٚوایش برژێنە بەسـەر خـاوخێزانو یارویاوەرانی بەئەندازەی ڕادەی فراوانـی زانیـاری نووریـنو تێنـووسو پێنووسـی گوشـادو بـەرفراوانت، پـەروردگارا؛ لـە(ابـی بکـر)و (عثمـان)و (علـی)و سـەرجەم هـاوەڵانو شـوێنکەوتوانیان تـا ڕۆژی دوایـی ڕازیببەو بەزەیت پێیاندا بێتەوەو بیانبەخشە)).

((سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ وَسَلاَمٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ، والحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ))[٥١].

واتــە: ((پــاکیو بێگــەردی بــۆ پــەروەردگارت ، پەروەردگاری خاوەن دەستەلاٚت ـ لەوەی کەئەوانە دەیدەنە پاڵ ئەو زاتە بێهاوەڵو هاوتایە، سلاٚوو درودیش لەسەر هەموو پێغەمبەرانو سەرجەم فرستادەکانی خوا، سوپاسو ستایشیش بۆ خوا ، پەروەردگاری هەموو جیهانان هەمیشە بەردەوام))[٥٢].

---

[٥١] لـەدوعاکانی شـەوو ڕۆژدا باسـکراوە لـەکۆتایی کـۆڕو دانیشـتندا فەرموودەی(٢٨).

[٥٢] تەفسیری ئاسان: ٤٥٢.

# چەند سوودێك

براو خوشكی بەڕێز..

ئەگەر كاتو ماوەت كەم بوو یان نەفست ساردوو هیمەتت نزم بوو لەئامادەبوونی كۆڕو دانیشتنی زیكر بەكۆمەڵ ئەوا یادو زیكرەكان كورت بكەرەوە بەم چەشنەی لای خوارەوە:

١ ـ پەنا بەخوا بگرەو هەریەك لە (فاتحە)و (ایە الكرسی)و كۆتاییەكانی سوورەتی (البقرە) یەكجار بخوێنە.

٢ ـ سوورەتی (الاخلاص)و (الفلق)و (الناس) سیٚجار بخوێنە.

٣ ـ پاشان بەردەوامبە لەدوای سوورەتی (الناس) هەتا زیكری (شانزا) كە (اللهُمَّ أنْتَ رَبِّي لاَ الهَ الاّ أنْتَ ..)ە سیٚجار.

٤ ـ پاشان (٣)جار (أسْتَغْفِرُ اللهَ العَظِيم)بكە.

٥ ـ ئنجا (سُبْحَانَكَ اللهُمَّ وَبِحَمْدِكَ اشْهَدُ ..)سیٚجار بڵێ.

٦ ـ دواتر بەسلاٌواتدان لەدیاری پێغەمبەر (ﷺ) داوای رازی بوون لەیارو شوێنكەوتوانیو (سُبْحَانَ رَبِكَ رَبِّ العِزَةِ عَمَا يَصِفُون ..)دوایی بەویردو زیكرەكانت بهێنە.

٧ ـ لەنێوارانیشدا لەجیاتی وشەی (اصبَحْنَا) رۆژمان لێبوویەوە ، وشەی (امْسَيِنَا ) شەومان بەسەردا هات) ببە.

# دروستو گونجاندنی چارەسەر بەدوعا

١ ـ قَالَ عَبْدُالله بـنُ عَبَاس (ﷺ) : كَانَ رَسُولُ الله(ﷺ) يُعَوذُ الحَسَنَ وَالحُسَينَ (ﷺ) : ((أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ الله التَامَةِ مِنْ كُلِ شَيْطَانٍ وَهَامَةٍ وَمِنْ كُلِ عَيْنٍ لامَةٍ)) يَقُولُ: [إنَّ اباكُمَا كَانَ يُعَوذُبِهِمَا اسمَاعِيلَ وَاسْحَاقَ][1].

واتە: (عبدالله)ی کوڕی (عباس) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوعای بەسەر (حەسەن)و (حسێن)دا ڕەزای خوایان لێبێـت ـ دەخوێنـدو دەیفەرموو: ((پـەناتان دەدەم بەوشـە پـیرۆزو تـەواوەکانی پـەروەردگار لەهەموو شەیتانێکی گومـان دروسـتکەرو چـاوێکی پیس‌و چڵکن‌و ئێرەیی خوان)) پاشان (ﷺ) دەیفەرموو: ((ابراهیم)ی باوکتان پەنای بە(اسماعیل)و (اسحاق) دەگرت پێی)).

٢ ـ وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا انَّ النَبِـيَّ (ﷺ) كَانَ اذَا اشْتَكَى الأنسَان الشَئَ مِنْهُ ، اوْ كَانَ بِـهِ قَرحٌ او جـرحٌ قَال النَبِيَّ (ﷺ) بِاصْبعِهِ هَكَذَا وَوَضَعَ سُفيَان بـن عُيَيْنَةَ اصْبعَهُ بِالأرْضِ ثُمّ رَفَعَهُمَا وَقَالَ: (بِسْمِ الله تُرْبَةُ ارْضِنَا بِرِيقَةِ بَعْضُهَا يُشْفَى سَقِيمُنَا بِأذنِ رَبِنَا))[2].

واتە: (سفیان)ی کوڕی (عویەینە) لە خاتوو (عائشە)ی دایـك موسـوڵمانانەوە ڕەزای خـوای لێبێـت. دەگێڕێتـەوە ؛

---

[1] اخرجه البخاري.

[2] متفق عليه.

دەفەرموێت: گەر درمێك یان ئازارێك رووی بکردایەتە یەکێك و نەخۆش بکەوتایە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستی دەکرد بەخاكو خۆڵی دەوریداو پاشان بڵندی دەکردەوەو دەیهێنا بەنەخۆشەکەداو دەیفەرموو: بەناوی خوا خاكو خۆڵی زەویمان گەشو جوانی هەندێکمانەو بەویستی پەروەردگارمان چارەسەی نەخۆشو درمدارمانی پێدەکەین)).

٣ ـ عَنْ عوف بنُ مَالكٍ (ﷺ) قَالَ : كُنَّا نَرقَى فِي الجَاهلِيَةِ فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللهَ كَيْفَ تَرَى فِي ذلكَ؟ فقَالَ: اعْرِضُوا عَلَيَّ رُقَاكُم. لاَبَأسَ بِالرُّقَى مَالَمْ يَكُنْ فِيهِ شِرْكٌ))[٣].

واتە: (عوف)ی کوڕی (مالك) ـرەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: لەکاتو تافی نەفامیدا چارەسەرمان بەدوعا دەکرد، ئەویش فەرمووی: نزاو دوعاکەتانم پیْبڵێن، گونجاوو دروستە گەر هاوەڵ پەیداکردنی تێدانەبێت بۆ پەروەردگار)).

٤ ـ وَقَالَ الرَّبِيعُ: سَألْتُ الشَافعِيِ عَنْ الرُّقْيَةِ فَقَالَ: لاَ بأسَ انْ تُرقى بِكِتَابِ الله ، وَبِمَا تَعْرِفُ مِنْ ذكرِ الله قُلْتُ: ايَرقَى أهْل الكِتَابِ المُسْلِمِينَ؟ قَالَ نَعْم ، اذَا رَقُوا بِمَا يَعْرِفُ مِنْ كِتَابِ الله تَعَالَى وَبِذِكْرِ اللهِ تَعَالَى)).

واتە: (ربیع) ـ خوای لێرازی بێت ـ دەفەرموێت: دەربارەی چارەسەر بەدوعا لەپێشەوا (شافیعی)م پرسی لەوەلامدا وتی: چارەسەرە بەدوعاکانی قورئانو یادو زیکرەکان

[٣] رواه مسلم وأبوداود.

گونجاوو دروستە، منیش پرسیم: ئایا دروستە پەیامدارانی ئاینەکانی دی چارەسەری موسوڵمانان بەدوعا بکەن؟ فەرمووی: بەڵێ، بەمەرجێك چارەسەر بەئایەتەکانی قورئانو یادوزیکرێك بکەن روونو ئاشکرابێت لای موسوڵمانان)).

## مشتێك لەچارەسەر بەدوعا لەلایەن پێغەمبەرەوە( ﷺ )

١ ـ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا اَنَّ النَبِيَّ (ﷺ) كَانَ يُعَوِذُ بَعْضَ اَهْلِه يَمْسَحُ بِيَدِه اليُمْنَى وَيَقُول: ((اللهُمَّ رَبَّ النَّاسِ اَذْهِبِ البأسَ وَاشف اَنْتَ الشَافِي لاَشِفَاءَ الاَّ شِفَاؤُكَ شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَماً))[٤].

واتە: خاتوو (عائشە)ی دایکی موسوڵمانان ــ رەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا(ﷺ) چارەسەری خاوخێزانی بەدوعا دەکردو دەستی راستی دەهێنا بەشوێنو جێگەی ئازارەکەداو دەیفەرموو: ((خوایەگیان ئەی پەروەردگاری خەڵکی ئێشو ئازار بڕەوێنەرەوەو چارەسەری بکە هەر تۆ خاوەن چارەسەریو بەچەشنێکی لێ بکە جارێکی دی هەرگیز ئێشو ئازارو ژان رووی تێنەکات)).

٢ ـ وَعَنْ عُثْمَان بنُ اَبِي العَاصِ اَنَّهُ شَكَا اِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَجَعَاً يَجِدُهُ فِي جَسَدِهِ مُنْذُ اَسْلَمَ ، فَقَال رَسُول اللهِ (ﷺ) :

---

[٤] متفق عليه.

((ضَعْ يَدَكَ عَلَى الذي يَألَمُ مِنْ جَسَدِكَ وَقُلْ: بِسْمِ الله ثلاَ ثاً. وَقُلْ سَبْعُ مَرَاتٍ : اعُوذُ بِعِزَةِ اللهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِ مَا اجِدُ وَاُحَاذِرُ))[٥].

واتە: (عثمان) ی كوڕی (ابی العاص) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەوكاتەوە موسوڵمان بووبوو ئێش و ئازارێك ڕووی كردبووە جەستەی و لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسیكرد ، ئەویش (ﷺ) فەرمووی: دەستت بخە سەر ئازارەكەو بڵێ: ((بەناوی خوا)) و حەوت جار بڵێ: ((پەنادەگرم بەمەزنی و توانای پەروەردگار لەشەڕو خراپەی ئەوەی ڕووی تێكردووم و ئەوەشی لێی دەترسم و خۆی بەدوور لێدەگرم)).

٣ ـ وَعَنْ ابِن عَبَاس (ﷺ)عَنْ النَبيِّ (ﷺ) قَالَ: مَنْ عَادَ مَرِيضاً لَمْ يَحْضُر اجَلَهُ فَقَالَ عِنْدَهُ سَبْعُ مَرَاتٍ : ((اسْألُ اللهَ العَظِيمِ رَبِّ العَرْشِ العَظِيمِ انْ يَشْفِيكَ )) الا عَافَاهُ اللهَ))[٦].

واتە: (ابن عباس) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە؛ دەفەرموێت: ((ئەوەی سەردانی نەخۆشێك بكات و هێشتا كات و وادەی مردنی نەهاتبێت ئەوا حەوت جار بڵێ : ((داواخوازم لەپەروەردگاری عەرشی مەزن ساغ و تەندروست و چاكت بكاتەوە ، بێگومان پەروەردگار ساغ و چاكی دەكاتەوە)).

---

[٥] اخرجه مسلم.

[٦] اخرجه ابوداود والترمذي وقال حديث حسن وقال الحاكم صحيح على شرط البخاري.

٤ ـ وَعَنْ أنَسُ بنُ مَالَك (ﷺ) قَال: كُنَّا مَعَ رَسُولُ الله (ﷺ) في المَسْجِدِ حَتَّى اِذَا طَلَعَت الشَمْسُ خَرَجَ رَسُول الله (ﷺ) وَاتبَعْتُهُ فَقَالَ: انْطلق بِنَا نَدْخُل عَلَى فَاطمَة بنت مُحَمَدٍ ، فَدَخَلْنَا وَاِذَا هِيَ نَائمَةٌ مُضْطَجِعَةٌ فَقَال: يَا فَاطِمَةُ مَايُنِيمُكَ هَذِه السَاعَةَ؟ قَالَتْ : مَازِلْتُ مُنْذُ البَارِحَة مَحْمُومَةً ، فَقَال: فَأيْنَ الدُعَاءَ الذيٍّ عَلَمْتُكَ؟ قَالَتْ نَسِيتُهُ قَالَ: فَقُولي ((يَا حَيُّ يَاقَيُوم بَرَحْمَتك اَسْتَغِيثُ ، اَصْلِحْ لِي شَأنِي كُلَّهُ ، وَلاَ تَكِلْنِي اِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ ، وَلاَ اِلَى أحَدٍ مِنْ النَاسِ))[٧].

واتە: (أنس) ی کوڕی (مالك) ڕەزای خوای لێبێت . دەفەرموێت: بەیاوەری پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەمزگەوت بووین کاتێ تیشکی خۆر بەدەرکەوت و پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوەدەرەوەو بەمنیشی وت: بابچین بۆ لای (فاتمە)ی کچم ، کاتێ چووین بۆماڵیان (فاتمە) نوستبوو هێشتا هەڵنەستابوو، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: (فاتمە) بۆلەم کاتەدا نووستویت؟ ئەویش وتی: لەدوێنێوە تووشی لەرزوتایەك هاتووم و پەرێشان بووم، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: ئەی کوا ئەوا دوعاو نزایەی فێرم کردیت؟ وتی: لەبیرم چووەتەوە فەرمووی بڵێ: پەروەردگاری زیندوو راگرو رێکخەری کاروبارەکان پەنادەگرم بەسۆزو میهرو بەزەیی تۆ ، داواخوازم سەرجەم کاروبارەکانم بۆ چاك و باش بکەیت و بۆ وچانێکیش نەم سپێری بەنەفسی خۆم و خەڵکی دی)).

---

[٧] رواه الطبراني في الأوسط.

٥ ـ وَعَنْ مُحَمَدِ بن سَالَم قَالَ: قَالَ لِي ثَابِتُ البَنَانِيِ: يَا مُحَمَد اذَا اشْتَكَيتَ فَضَع يَدَكَ حَيْثُ تَشْتَكِي ، ثُمَّ قُلْ: ((بِسْمِ الله أعُوذُ بِعِزَّةِ الله مِنْ شَرِ مَا أجِدُ مِنْ وَجَعِي هَذَا)) ثُمَّ ارْفِعْ يَدَكَ ثُمَّ اعد ذَلكَ وِتْراً ، فَأنَّ انَس بن مَالِك حَدَثَنِي : انَّ رَسُول الله حَدَثَهُ بِذَلِكَ))[٨] .

واتـه: (محمـد)ی كوڕی (سـالم) ـ ڕەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت: (ثـابت)ی (بنـانی) پێـی وتم: ئەی (محمـد) گـەر نـەخۆش و ناساغ بوویت دەستت بخە سەر جێگـەو شـوێنی ئازارەكـەت و بڵـێ: بـەناوی خـوا پـەنادەگرم بەمـەزنی و شـكۆمەندی پـەروەردگار لەشـەڕ خراپـەی ئـەوەی هەسـتی پێدەكەم و ئازارم دەدەن، پاشان دەسـت هـەڵبگرەو جـارێكی دی هەمان كردار دووپات بكەرەوەو چەندجارێك بیكه بەڵام با تـاك بێـت ، ئەمـەش (انـس)ی كـوڕی (مـالك) پێـی وتم و لەپێغەمبەرەوە گێڕاویەتیەوە)).

٦ ـ وَعَنْ سَعْدِ بـنُ ابِـي وَقَـاصٍ (ﷺ) ، انَّ رَسُولَ الله (ﷺ) عَادَهُ فِي مَرَضِه فَقَالَ: ((اللهُمَّ اشْفِ سَعْداً ، اللهُمَّ اشْفِ سَعْداً، اللهُمَّ اشْفِ سَعْدَاً))[٩] .

واته: (سعد)ی كوڕی (ابی وقاص) ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: نەخۆشكەوتم و پێغەمبەری خواش(ﷺ) سەردانی

---

[٨] رواه الترمذي.

[٩] رواه مسلم.

کردمو سیٚجار فەرمووی: (پەروەردگارا شیفاو چارەسەری سەعد بکەی)).

٧ ـ وَعَنْ عَبْدُالله بِنُ عمرو بن العَاص (ﷺ) قَال: قَالَ النَبِيُّ (ﷺ) : اذَا جَاءَ الرَّجُل يَعُودُ مَرِيضَاً فَلْيَقُلْ : اللهُمَّ اشْفِ عَبْدَكَ يَنْكأ لَكَ عَدواً ، أوْ يَمْشِي لَكَ الَى صَلاَةٍ))[١٠].

واتە: (عبدالله)ی کوڕی (عمرو) ی کوڕی (عاص) ـ ڕەزای خـوای لێبێـت . لەپێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) دەگێڕێتـەوە؛ دەفـەرموێت: کـاتێك سـەردانی نەخۆشـتانکرد بلێـن: پەروەردگارا؛ شیفاو چارەسەری بەندەکەت بکە هەتا دوژمنت بۆ تێك بشکێنێ یان بێت بۆ نوێژ لەمزگەوت)).

٨ ـ عَنْ عَلِيِّ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ شَاكِياً فَمَرَ بِي رَسُول الله (ﷺ) وَأنَا أقُولُ: ((اللهُمَّ انْ كَانَ اجَلِي قَد حَضَرَ فَأرِحْنِي وَانْ كَانَ مُتَاخِراً فَأرفَعْهُ عَنِي، وَانْ كَانَ بَلاَءً فَصَبِرْنِي ، فَقَال رَسُول الله (ﷺ) : (كَيْفَ قُلْتَ؟) فَأعَادَ مَـا قَالَـهُ ، فَضَرَبَـهُ بِرِجْلِـه وَقَال: ((اللهُمَّ عَافِـه ، أوْ اشْـفِه ، شَكَ شَعْبَهُ ، قَال: فَمَا اشْتَكَيْتُ وَجَعِي بَعْدُ))[١١].

واتـە: (علـی) ـ ڕەزای خـوای لێبێـت ـ دەفـەرموێت: نەخۆش‌و ناساغ بووم پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەردانی کردم‌و منیش نزام دەکردو دەمـوت: ((پـەروەردگارا؛ گـەر وادەی چارەنووس‌و ئەجەلـەم داهـات گیـانم بکێشـەو ؛ خۆئەگـەر

---

[١٠] سنن ابي داود فقال: النووي حديث حسن حسنه الحافظ وغيره.

[١١] رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح.

ئەجەلیشم هێشتا وادەو کاتی نەهاتووە شـیفاو چارەسـەرم بکەو ، ئەگەر ئەم حاڵـەش بەلاو تاقیکردنەوەیە ئارامگرتن و دان بـەخۆداگرتنم پــێ ببەخشــە)) پێغەمبــەری خــواش(ﷺ) گوێبیستی نزاکەم بوو پێـی وتم: ئەوەی وتت بۆم دووبارە بکـەرەوە، دوای ئـەوەی دووبـارەم کـردەوە بــەقاچی پیـایدا کێشـام و فـەرمووی: ((پـەروەردگارا؛ شیفاو چارەسەری لـەش ساغیم پێ ببەخشە))پاشان دەستی.کرد بەنێویەکداو ئەوجا وتـی: ((لـەدوای ئـەو نزایـەوە لەشم سووك بـوو تەندروسـتیم باش بوویەوە)).

٩ ـ عَنْ أبِي سَعِيدِ الخُدْرِيِّ (ﷺ) : ((انَّ جِبْرِيلَ اتَى النَبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا مُحَمَد ، اشْتَكَيْتَ ؟ قَالَ : نَعْم قَال: ((بِسْمِ الله أرقِيكَ مِنْ كُلِّ! شَيْ يُؤْذِيكَ مِنْ شَرِ كُلِ نَفْسٍ اوْ عَيْنِ حَاسِدٍ ، اللهُ يُشْفِيكَ ، بِسْمِ اللهِ ارْقِيكَ))[١٢].

واتـە: (ابـی سـعید) ی (خـدری) ـرەزای خـوای لێبێـت ـ دەفــەرموێت: جارێکیــان جوبرەئیــل هــات بــۆ خزمــەتی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)و پێـی وت: ئــەی (محمـد) ناسـاغیت؟ ئەویش فـەرمووی: بـەڵێ ، جوبەرئیلیش فـەرمووی: بـەناوی خوا چارەسـەرت دەکەم لەسـەرجەم ئێش و ئازارێك ژانت پـێ بگەیەنێت و لەهەموو چاوێکی پیس و چڵکن و ئێرەیی، خوا چارەسەرو شیفات بدات، بەناوی خوا چارەسەرت دەکەم)).

---

[١٢] رواه النـووي في صحيـح مسـلم والـترمذي والنسـائي وابـن ماجـه باسانيد صحيحة.

١٠ ـ وَعَنْ انَس (ﷺ): (انَّ رَسُولَ الله دَخَلَ عَلَى اعْرابيٍّ وَهُوَ مَحْمومٌ فَقَال: (( كَفَّارَةٌ وَطَهُورٌ))[١٣].

واتـــە: (انـــس) ــ ڕەزای خـــوای لێبێـــت ــ دەفـــەرموێت: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) چـوو بـۆ لای عـەرەبێکی بیابـان نشـین کەتووشی لەرزوتا هاتبوو پێی فەرموو: ((نەخۆشیەکەت پاك بوونەوەو بری گوناهت کەوتبێت)).

١١ـ عَنْ سَلْمَان (ﷺ) قَـال: ((عَـادَني رَسُـولُ الله (ﷺ) وَانَـا مَرِيضٌ فَقَالَ: ((يَـا سَلْمَان شَفَى اللهُ سَقَمَكَ ، وَغَفَـرَ ذَنْبَـكَ ، وَعَافَاكَ فِي دِينِكَ وَجِسْمِكَ الى مَدَةِ أجَلَك))[١٤].

واتـــە: (سلمان) ــ ڕەزای خـــوای لێبێـــت ــ دەفـــەرموێت: نەخۆش بووم پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەردانی کردم‌و پێی وتم: ((ئـەی سـەلمان پـەروەردگار شیفای ناسـاغی‌و نەخۆشـیت بـدات‌و لـەگوناەو تاوانـەکانت ببورێـت‌و ئـاین‌و جەسـتەت ساغ‌و بێوەی بکات هەتا وادەی مەرگ‌و کۆچ کردنت)).

١٢ ـ وَعَنْ عُثْمَان بنِ عَفَان (ﷺ) قَالَ: ((مَرِضْتُ فَكَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُعَودُنـي يَومَـاً فَقَـالَ : (بِسْـمِ الله الرَحْمَـنِ الرَحِيـمِ ، أُعِيذُكَ بِالله الأحَدِ الصَمَدِ الذيٍّ لَمْ يَلِد وَلَمْ يُولَد ، وَلَـمْ يَكُنْ لَـهُ كُفواً احَدٍ مِنْ شَرِ مَايَجِد)) فَلَمَا استقلَ رَسُولُ الله (ﷺ) قَائِماً قَالَ: ((يَاعُثْمَان يَعُوذُبِهَا فَمَا تَعَوذْتُم بِمِثْلِهَا))[١٥].

---

[١٣] رواه النووي في كتاب ابن السني وقال حديث حسن.

[١٤] رواه ابن السني.

[١٥] رواه ابن السني.

وات: (عثمان) ی کوڕی (عفان) ــرەزای خـوای لێبێـت ــ دەفـەرموێت: ناسـاغ‌و نـەخۆش بـووم پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) پەنای پێدەگرتم‌و لەنزاو دوعاکانیدا هاتبوو: (بەناوی خوای بەخشـندەو میـهرەبان پـەنات پێدەگـرم لـەوەی هەسـتی پێدەکـەیت‌و ئـازارت دەدات ، پـەروەردگاری پایـەدارو دەسـتەلأتدار کـەنیازی بەکـەس نی‌یـەو هـەموو ئاتـاجی ئەون‌و هـەر ئـەو دەتوانێـت بـەلأو ناخۆشـی لابـەرێت‌و هیـچ کەسی لێ‌نەبووەو خۆشی لەکەس نـەبووە و ، هـەرگیز هاوتاو هاوشـێوەو دەسـەلأتدارێکی تـر نیـە کەلەبەرامبـەر بـەو بوەستێت‌و هاوشانی بێت)) ئنجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەستا لـەلای‌و بـەپێوە فـەرمووی: ((ئـەی (عوسمـان) بـەم چەشـنە پەنابگرەو هەرگیز هاوچەشنی ئەمەت دەست ناکەوێت)).

## پەناگرتن بە پەروەردگار لەناساغی‌و نەخۆشی پێش ڕوودانی

١٣ ـ وَعَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ ابِي عَسِيبٍ مَولاَةٌ رَسُولِ الله (ﷺ) أنَّ امْرَاةً مِنْ جَرْشٍ اتَت رَسُـول الله(ﷺ) عَلَـى بَعِيرٍ فَنَـادَتْ: يَـا عَائِشَـةَ اعِينِيـنِي بِدَعْـوَةٍ مِـنْ رَسُولِ الله (ﷺ) تَسـكِنني ـــ أوْ تَطْمَئِنِي . قَالَتْ لَهَا ضَعِي يَدكَ اليُمْنَى عَلَى فُؤادك فَامْسَحْهُ وَقُولِـي: بِسْـم الله ، اللـهُمَّ دَاوِنـي بِدَوَائِـك وَاشْـفِنِي بِشِـفَائِك وَاغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَنْ سِوَاكَ وَ أحذر عَنِي اَذَاك)).

واتە: خاتوو (میمونه)ی کچـی (ابـی عسـیب)ی کـەنیزەکی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەفـەرموێت: ئافرەتێکی‌تیرەی (جـرش)

بەسواری وشتر هات بــۆ لای پێغەمبــەرو بـانگی کـرد: ئـەی (عائشە) دوعاو نزایەکم فێریکە لەپێغەمبەری خوات بیستبێ هەتا دڵم ئارامو هێمن بێتەوە، خاتوو (عائشە)ش فەرمووی: دەستی راستت بخە سەر دڵتو پێیدابهێنــەو بڵــێ: ((بەناوی خــوا پــەروەردگارا؛ چارەســەرو شــیفام بــدە بەچارەســەرو شـیفای خـۆتو بێباکم بکـە لەخـەڵکیو ئێـشو ئازاریشـم بشکێنە)).

١٤ ـ عَـنْ أنَـس (ﷺ)قَـالَ: كَـانَ النَبِـيُّ (ﷺ) يَقُـولُ: ((اِنِـي اَعُوذُبِكَ مِـنَ الفسُـوقِ وَالشـقَاقِ وَالنِفَـاقِ وَالسُـمْعَةِ وَالرِيَـاءِ ، وَاَعُوذُبِـكَ مَـنَ الصَمَـم والبُكْـم وَالجنُــونِ وَالجَــذَامِ وَسَــئ الأسْقَام))[١٦].

واتە: (انس) ـرەزای خوای لێبێت ـ لەپێغەمبــەری خـواوە (ﷺ) دەگێڕێتــەوە؛ دەفــەرموێت: ((پــەروەردگارا ؛ پــەنات پێدەگـرم لەخراپــەو پەشـێویو دووڕوویــیو رووپامــاییو کەڕیو لاڵیو شێتیو گەڕیو نەخۆشی خراپ)).

---

[١٦] رواه الطبراني.

# سەرچاوەکان

تەفسیری ئاسان / بورهان محمد أمین
الاذكار ـ النووي
المأثورات ـ الأمام حسن البنا
النصيحة في الأدعية الصحيحة ـ للحافظ المقدسي
المناجاة ـ الأمام حسن البنا
الكلم الطيب ـ ابن تيمية
فضل الصلاة على النبي ـ الأمام اسماعيل ابن اسحاق القاضي
الوابل الطيب من الكلم الطيب ـ ابن القيم الجوزية
اللهم ـ المأثورات ـ محمد عاشور
فقه السنة الجزء الأول ـ سيد سابق
رياض الصالحين ـ النووي ـ تحقيق رضوان محمد رضوان

# ناوەرۆك

بابەت | لاپەڕە

## بەشی سێیەم
## یادوزیكرەكانی شەوو رۆژ

## بەشی چوارەم
## پاڕانەوەی بۆنەكان

## بەشی پێنجەم
## دوعاكانی نوێژ

## بەشی شەشەم
## داوای لێخۆشبوون



## بەشی حەوتەم
## سلاَواتدان لەدیاری پێغەمبەر(ﷺ)

## بەشی هەشتەم

## ویردو زیكری بەیانیان و ئێواران

## (المأثورات)



## بەشی نۆیەم

## چارەسەر بەدوعا (رقی)

۲۰۰۰ ت

پەروەردگارا: ببورە لەتاوانو هەڵەو نەزانینو زیادەڕدوی لەڕەفتارو کردارەکانم و ئەوەشی تۆ شارەزاو زانای پێم.

پەروەردگارا: ببورە لەڕاست و گاڵتەو هەڵەو دەستەنقەست و هەمووی هەر لەخۆمەوەیە.

پەروەردگارا: ببوورە لەرەفتارو کردارەکانی پاشو پێشو دیارو پەنهانو ئەوەی تۆ شارەزاو زانای لێمو هەر تۆ پاشو پێشخەری کردارەکانیو زاڵو دەستە لاّتداری بەسەرجەم ویستەکاندا.


ISBN 964-356-340-5
9789643563400